# ئارام گرتن وخۆنەویستن

((خورەوشتی ئیماندار))

نووسینی :عەمر خالید

وەرگێڕانی:کانیاو محمد لەک

کتێبخانەی نارین

هەولێر

بسم الله الرحمن الرحيم

# ئارامگرتن

## ئارامگرتن

### دایکی ڕەوشتەکانە

سەبر و ئارامگرتن ڕەوشتێکە لە ڕەوشتە سەرەکی یەکانی ئایینە ڕاست و ڕەواکەمان، بە گشتی پەلی هاوێشتۆتە ناو هەموو لایەنەکانی ژیانی ئادەمیزادەوە.

هەندێك لە گەنجان دەڵێن: من دەناڵێنم بە دەست فلان تاوانەوە، چ کارێك بکەم باشە؟ منیش پێ ی دەڵێم: ئارامبگرە، وا دەزانێ ئەوەی پێی دەڵێم قسەی سەر زاری یە. یەکێکی تر دەڵێ: هەوڵ دەدەم بۆ نوێژی بەیانی زوو هەڵسم، بەڵام ناتوانم، چی بکەم باشە؟ منیش پێ ی دەڵێم: ئارامبگرە!

دیارە مانای ڕاست و دروستی ئارامگرتن لە ناو چووە و نەماوە وە ووشەی ئارامگرتن لای زۆربەمان بۆتە ووشەیەکی تیۆری

سەرزاری. بەڵام کێ لە ئێمە وەك پرۆگرامێکی کرداری بۆ چارەسەری هەر گیرۆگرفتێك ، وە بۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێك دەیبینێ...!؟

**ئارامگرتن کلیلی... بوونە !**

سەرنج بدە و بیرێك لە دروستکراوەکانی خودا بکەوە...مرۆڤ لەناو سکی دایکی بەچەند قۆناغێك دروست دەبێت و گەورە دەبێ... رووەکیش (گوڵ و دار و گژوگیا ) بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت تا گەشە دەکات و پێ دەگات... وە هەروەها کە سەیری ڕۆژ و شەو دەکەین دەبینین بەیانیان خۆر هێدی هێدی هەڵدێت و بەدەردەکەوێت پاشان وورده وورده دەمەو ئێوارە وون دەبێت و ئاوا دەبێت... خودای بەخشندە و میهرەبان ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژ دروستکردووە، لەو کاتەی کە دەیتوانی بە توانا و هێز و دەسەڵاتی خۆی بە یەك ڕۆژ یان بە چاو تروکانێك دروستیان بکات...!

لێرەدا خوای بێ هاوتا و گەورە ویستی بە دروستکردنی شەش ڕۆژیی زەوی و ئاسمانەکان ، ئەوەمان فێر بکات کە هەموو شتێك لەم بوونەدا ئارامگرتنی دەوێ و وورده وورده دروست دەبێت...کەواتە ئارامگرتن کلیلی دروستبوونە.

پاکی و بێگەردی بۆ خوا... ! بوون و دروستبوون هەر هەمووی لەسەر بناغەی ئارامگرتن قۆناغ قۆناغ دروست بووە ودروست دەبێت.

هەموو شتێك لە ژیاندا ئارامگرتنی دەوێ

گەر دەتەوێ لە کار و پیشەتدا سەرکەوی وبڕوانامە وەرگری پێویستە شازدە ساڵ بخوێنی و ئارامبگری..ئەگەر دەتەوێ گوێڕایەڵی خودا بیت پێویستە لەسەر ئەو گوێڕایەڵیانە ئارامبگری...گەر دەتەوێ واز لە گوناه و تاوان بێنی (ژەنگ و قرێژەکان لە دڵ لابەری)! دەبێ ئارامبگری وە بە ورەیەکی بە هێز نەفسی خۆت بگری و بەرنامەڕێژی وورد و جوانی بۆ دابنێیت.

دە بزانە تا چ ڕادەیەك ڕەوشتی ئارامگرتن هەموو کون و کەلەبەری ژیانمانی گرتۆتەوە، بوونی وەك پێویست وە دەست پێوە گرتنی مایەی بەختەوەری و شادمانی و سەرکەوتنە ، هەر لەبەر ئەوە زاناکان دەڵێن ((کامڵی دونیا و ئایین بە ئارامگرتنەوە بەندە)).

پاکی و بێ گەردی بۆ خوا !! ئایا هیچ ئازایەتییەك بە بێ ئارامگرتن هەیە؟ ئایا ئاوەدانکردنەوەی وولات و دروست کردنی کۆشك و تەلار و بەستەکان بێ ئارامگرتن دەبێت؟ ئایا چاکە کردن و گوێڕایەڵی دایك و باوك بە بێ خۆگرتن دەبێت؟ ئایا گەشە کردن و پەرە پێدانی ئابووری وولات بە بێ ئارامگرتن دەبێت؟

ئایا خوێندنەوەی ئەم پەرتووکە وە کار وکردەوە پێ کردنی بە بێ ئارامگرتن دەبێ؟!

**بە بێ ئەو ڕەوشتە مرۆڤ دەفەوتێت... !**

چی وای لە مرۆڤی داوێن پیس کردووە گوناه و تاوانی ناشەرعی ئەنجام بدات؟ لەبەرئەوەی ئارامی نەگرتووە تا ئەو کاتەی حەلالی خۆی بە قسمەت دەبێ.

ئەی چ هۆیەك وای لەو کەسە کردووە خۆی لەسەر تلیاك و مادده بێهۆشکەرەکان ڕابهێنێ ؟ چونکە ئەو لەسەر ئەو بەلا و نوشوستیانەی کە بەسەری هاتبوو ئارامی نەگرت یاخود لەسەر ئەو کاتە بەتاڵ و بێ ئیشییەی کە هەیبوو ئارامی نەگرت و خاوەن بەرنامەی ڕاست و دروست نەبوو...

خۆ ئەگەر سەبر و ئارامگرتن نەبێ ئەوا هەموومان سەرقاڵی گوناه و حەرام دەبین لە ئەنجامدا مرۆڤایەتی پەکی دەکەوێت...

بە ڕاستی تەواوی ئایین و دونیا بە ئارامگرتنەوە بەندە...

دەی هەڵسە و بە ئاشکرا ڕایگەیێنە! لەوەودوا ئەم تاوانە ئەنجام نادەم ئارام دەگرم وخوا لەگەڵمە و پشتیوانمە.

## لە یەک چوونێک ماناکە ڕوون دەکاتەوە

زاناکان دەڵێن: هەر نەفسێك ڕکێفی بەندەکە خۆیەتی یان بۆ بەهەشتی دەبات یانیش بۆ دۆزەخ، وە لغاوی نەفسیش ئارامگرتنە،

جا هەر کە لغاوەکەت بەرداو بەرەڵڵات کرد ئەوا نەفست چی بوێ بۆ ئەوێت دەبات.

چی دەکەیت گەر سواری ئۆتۆمبێلەکەت بوویت وە بە خێرایی ١٠٠ کم ڕۆیشتیت پاشان زانیت ئۆتۆمبیلەکەت سوکانی ناسوڕێ یان (ئامێری وەستانی) نەماوە !! باشە چی دەکەیت گەر زانیت دوا ڕێگات بەهەشتە یان دۆزەخ؟!... کۆنترۆڵەکەت ئارامگرتنە ئایا دەتوانیت بڕۆیت و کۆنترۆلی ئارامگرتنی خۆت لە دەست نەدەیت و بەسەر خۆتا زاڵ بیت؟

## ووشەی ئارامگرتن لە زماندا :

ووشەی ئارامگرتن لە زماندا واتە: گرتن یان مەنع کردن.

کە دەڵێی من ئارامم گرتووە واتە: من نەفسی خۆم گرتووە، من نەفسم مەنع کردووە...گەر بڵێی لە گوێڕایەڵییەکاندا نەفسی خۆم گرتووە واتە: درێژە بە گوێڕایەڵییەکان دەدەم و لەسەری بەردەوامم. ئەگەریش بڵێی من نەفسی خۆم لە گوناه و تاوانەکاندا گرتووە واتە: دەرگای تاوانم داخستووە.

خوایە گیان یارمەتیدەرم بە لە گرتنی نەفسم لە....... وە لە........ لە..... خوایە ئامین.

لێکدەرەوە...

ووشەی سەبر لە قورئانی پیرۆزدا (٩٠) جار نـاوی هـاتووە کـە هیچ ڕەوشتێکی تر ئاوا ئاماژەی پێ نەکراوە.

لە ڕاستگۆیی و ڕاسپاردە (ئەمانەت) زیاتـر باس کراوە ...ئاخۆ دەبێ نرخ و بەهای ئەم ڕەوشتە چەند بێ؟

ئـەی خـاوەن ڕەوشـتی (ڕاسـتگۆیی)، خـودا پاداشـتی خێرتـان بداتـەوە. ئـەی ئەوانـەی ئـەمانت پـارێزن، خـوا پاداشـتی خێرتـان بداتەوە. ئەی ئەوانەی بـە دڵسۆزی بـۆ خـودا خێـر و چاکە دەکەن ، خوا پاداشتی خێرتان بداتەوە. ئێستا کاتی ئەوە نەهاتووە خۆمان بە ڕەوشتی سەبر و ئارامگرتن بڕازێنینـەوە کە لـە قورئانـدا لـە هـەموو ڕەوشتەکانی تر زیاتر ناوی هاتووە.

## ئایا حەز دەکەیت لەگەڵ خودا بیت؟!

ئێستا کەش و دۆخێکی ئیمانی بۆ خـۆت برەخـسێنە، دەسـت بکـە بـە خوێندنـەوەی ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز، جـا وەهـا بیاخوێنەرەوە وەك چۆن بڵێی بۆ تۆ دابەزیووە.

ئایا تۆ ئامادەی لەگەڵ ئایەتەکانی خوا بژی؟

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾[1].

---

[1] سورة البقرة، ١٥٣.

واتـه: (داوای كۆمـەك و یارمـەتی لـە خـودا بكـەن بـە هـۆی ئارامگرتن و نوێژ كردنەوە، دڵنیا بن كە خـوا یـار و یـاوەری خـۆگر و ئارامگرانە)[1].

گەر ترسای نەفست تووشی تاوان و گونـاە بێـت، ئـارامبگرە و نوێژ بكە... بۆ بە گوێ ی خوا ناكەیت ، ئاخر لەو زیاتر كێت هەیە؟

گەر تام و چێژی ئەم ووشانە ناكەیت... هەر نەبێ سوودی لێ وەرگرە...

**مژدە بۆ تۆ ئەی ئارامگرەكە...!!**

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ﴾[2].

واتە (سوێند بە خوا تاقیتان دەكەینەوە بە كـەمێك لـە تـرس و بیم و برسێتی و كەم بوونی ماڵ و سامان و مردنـی كـەس و كـار و تیاچوونی بەروبوومی كشتوكاڵ، جا مژدە بدە بەو كەسانەی خۆگر و ئارامگرن).

ئـەوە كـێ یـە لێـرە مـژدە دەداتـە ئـارامگران و خـۆگران...؟ لەبیرنەكـەی وەهـاش قورئـان بخوێنیـەوە وەك چـۆن بلێـی بـۆ تـۆ دابەزیووە.

---

[2] سورة البقرة: ١٥٥

## پاداشتی بێسنوور و بێ ژماره

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾[1].

واتە: (بە ڕاستی تەنها خۆگران پاداشتیان بێ سنوور و بێ ژمارەیە).

ئەگەر خاکێکی ووشك و بێ ئاوت بینی.. پاشان بینیت خوا ئاوی موبارەکی بەسەردا باراند ... ئەنجامەکەی چی دەبێت؟... دەبا ئەو خاکە دڵی تۆ بێت بارانەکەش ئارامگرتنت بێت...

لە تەفسیر و ڕوون کردنەوەی ئەو ئایەتەدا دەڵێین: ئارامگران چاکە و خێر دەڕژێتە سەریان، چاکە و خێر ڕژانەکە بە بێ سنوورە و بێ ئەندازەیە. باشە، بۆ تەنها ئارامگران؟! چونکە ئەوان ئارامیان گرت لەسەر تاقیکردنەوەکانی دونیا... تەنانەت یەك ووشەی بێزاری و ماندوو بوون و توورە بوون لە دەمیاندا نەهاتە دەرەوە، لە دونیاشدا بە کار و فەرمان و قەزا و قەدەری خودا ڕازی بوون وە خواش لە ڕۆژی دوایی لێیانی نەپرسی یەوە، لەبەر ئەوە تەنها کارێك کە پاداشتەکەی نازانیت چەندە ئارامگرتنە، بۆ نموونە: پاداشتی کار و کردەوەی چاکەیەك بە دەیە، وە ئەوانەی ماڵ و سامان لە پێناوی خوا دەبەخشن پاداشتەکەی یەك بە حەوت سەدە.

---

[1] سورة الزمر: ١٠ .

بەڵام پاداشتی ئارامگرتن بێ سنوور و بێ ئەندازەیە... ئای چ خۆشی یەکە بۆ ئەو کەسەی کە ئەم ئایەتە چووە ناخی دڵیـەوە...و لەوێ جێگیر بوو.

## ئارامدەگری تا خوا خۆشتی بوێ...!؟

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾[1].

واتـە: (خـوای گـەورەش ئـەو ئـارامگر و خۆراگرانـەی خۆشدەوێت).

ئێستا لە کاری نابـەجێ ئارامـدەگری تـا خـوا خۆشـتی بوێـت؟ یان نا؟ ئارامدەگری ،چاوت لە نەزەر بپارێزی تا خوا خۆشـتی بوێـت؟ یان نا؟ ئارامدەگری، (لە پشت کردنە حەرام) تا خوا خۆشتی بوێـت ؟ یان نا؟ ئارامدەگری ،گوێڕایەڵی دایك و باوکـت بیـت تـا خـوا خۆشـتی بوێت، یان نا؟ ئارامدەگری، هەوڵ و تەقەلا بدەیت و بخوێنیت تا خوا خۆشتی بوێت یان نا؟

## پێشەوایەتی لە دونیا و ناییندا بۆ کێیە؟

خوای گەورە دەفەرموێ:

[1] آل عمران: ١٤٦ .

﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ﴾[1].

واته: (ئەوانەی خاوەن صەبر و دڵنیایی بوون بە ئایەتانی ئێمە، گێڕامانن بە پێشەوا، کە ڕێنومایی کاربوون بە فەرمانی ئێمە (شایستەی ئەو ڕێزە بوون).

ئەو ئایەتەی سەرەوە باس لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی نەوەی ئیسرائیل دەکات، بەڵام لێرەدا خودای گەورە ڕایگەیاندووە کە دەسەڵات وەرگرتن و پێشەوایەتی لە دونیا و ئاییندا بە دوو شت دەست دەکەوێت:

(١)ئارامگرتن. (٢) دڵنیایی و بڕوایی تەواو...

یەکەمیان: بە ئارامگرتن... ئارامگرتن لەسەر بەرهەم هێنان... ئارامگرتن لەسەر چاککردنی بارودۆخی وولات... ئارامگرتن لەسەر پەروەردەکردنی کەسێکی یان تاکێکی هۆشمەندی سەنگین... ئارامگرتن لەسەر دامەزراندنی خێزانێکی بەهێز و پتەو.

دووەم: بڕوا و دڵنیابوونی تەواو بە خوا...

ئەی خوایە... ئوممەتی ئیسلام لە دەست چووە و پارچە پارچە بووە...ئەی چۆن دەبێتە گەورە و پێشەوای گەلانی تر؟!!

## کارێکی چاك و پەسند

---

[1] سورة السجدة، ٢٤.

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

﴿وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾[1].

واتە (لە ڕاستیدا ئەوەی دان بە خۆیدا بگرێت و چاوپۆشی بکات و لێخۆشبوو بێت (لە کاتێکدا کە دەتوانێت تۆڵە بسێنێت) بە ڕاستی ئەوە کارێکی بەجێ و چاك و پەسند ئەنجام دەدات، بە ڕاستی ئەو لەو کارانەیە کە پێویستە بکرێت).

ئەو کارە چاك و پەسندە...کە تۆ ئارامبگری و لە خەڵك خۆش بیت...؟

خودا لەگەڵ ئارامگر و خۆڕاگرانە و خۆشیانی دەوێت، وە خودا مژدەیان دەداتێ، وە هەروەها پێشەوایی و دەسەڵات بۆ ئەوانە... هێشتا دەرفەتت لە پێش ماوە... بەڵام تکایە ئارام بە!

## فەرمانت پێ دراوە کە ئارامبگری

خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ﴾[2].

---

[1] سورة الشورى: ٤٣

[1] سورة الاحقاف: ٣٥ .

واته (دان بـه خـۆدا بگـره و خۆڕاگربـه (ئـەی پێغەمبـەر یـان (ئـەی ئیمانـدار)، هـەروەکو پێغەمبـەرانی خـاوەن ویـستی بـه هێـز و خۆڕاگربوون).

وه هەروەها دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[1].

واتـه: (ئـەی ئەوانـەی کـه باوەڕتـان هێنـاوه خـۆگربن و خـۆڕاگری و ئـارامگری بەسـەر خۆتانـدا بهێـنن، نەبـەزن لـه خـۆگری مانەوەتان لەسەنگەر دا، هەوڵ بدەن هەمیشه له سەنگەری خـەبات و کۆشـشدابن، لـه خـودا بترسـن و پارێزگـار بـن بـۆ ئـەوەی سـەرفرازی (هەمیشەیی) به دەست بهێنن).

سەرنج بدە... جەختکردنـەوه و دووپاتکردنەوەیـەکی بـەهێز لـه قورئانـدا لەسـەر خـۆگری و ئـارامگری بـۆ پێغەمبـەر(د.خ) و ئیماندارن.

ئایا ئەوانـه ووشـەی تیـۆرین...؟ پـاك و بێگـەردی بـۆ خـوا... بەڵکو ووشەی کردارین و دەبێ جێ بە جێ بکرێن.

بۆ نمونه ئەگەر تۆ گرفتار و گیرۆدەی دەسـت (.....) تـاوانی، ئەوا بە نـەفست بڵێ: ئارام بە ، خۆت بگرە و نەکەی...!!

---

[1] سورة آل عمران: ٢٠٠

## لەوەدا نەکەی...!

لە کار و کردەوە نا بەجێ و ناپەسندەکان لە کۆمەڵگای ئیسلامدا کە خودا پێی خۆش نی یە، بێ وورەیی و لاوازی سوور بوون و لاوازی خۆڕاگرتنە، بۆ نموونە خۆشکێك دەڵێ:

حیجابم کرد و بالاً پۆش بوومە بەڵام دەزانم پاش ماوەیەکی تر وازی لێ دێنم و لەچکەکە فڕە دەدەم (ئاخر من ئارامم نی یە و وورە لاوازم).

بەڵام من وەها ناتانبینم... دەبینم باشن وە هیچ کەم وکورییەکتان نیە،... بە ویستی خوا لە ئارامگرتنا بە هێز و وورە بەرز دەبن...

## ئەم ئامۆژگارییە بۆ تۆ...

کە چیرۆکی هەر پێغەمبەرێك دەخوێنیتەوە لە قورئانی پیرۆزدا ، وە کە سەیری کۆتایی چیرۆکەکە و دوا ڕیزی ئایەتەکە بکەیت و لێی ووردبیتەوە ، ئەوا کورتە و پوختەی چیرۆکەکە و چەند پەند و ئامۆژگارییەکی تیادا بەدی دەکەیت...بۆ نموونە لە سورەتی هوددا، لە دوا ئایەتی چیرۆکی پێغەمبەر نوح ، خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾[1].

---

[1] سورة هود، ٤٩ .

واته: (جا خۆگر و ئارامبه، چونكه بـه ڕاسـتی پاشـه ڕۆژ بـۆ خواناسان و پارێزگارانه).

پـاكی و بێگـەردی بـۆ خـودا... پوختـەی سەرگوزشـتەی پێغەمبـەر نـوح ئـەم دوا ڕیزەیـە (جـا خـۆگر و ئارامبـە، چـونكە بـە ڕاستی پاشەرۆژ بۆ خواناسان و پارێزگارانە).

خـوای گـەورە ئـەم سەرگوزشـتەیە بـۆ پێغەمبـەر(د.خ) دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی خۆگربێ و ئارامبگرێ، وە بۆ ئەوەی بزانێ كە سەركەوتن لە دونیا و ئاخیرەت هەر بۆ ئارامگرانە.

ئایا دەتوانی لە ئەمڕۆوە ئاوا قورئانی پیرۆز بخوێنیتەوە؟

**باش بزانە كە سەركەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە:**

خـوای پـەروەردگار فێرمـان دەكـات كـە سـەركەوتنی ئـایین و سەركەوتنی موسوڵمانان تەنها بە ئارامگرتنەوەیـە ،وە ئـەوەی لەسـەر حەق ئارامبگرێ هەر سەردەكەوێ.

خـوای گـەورە لـە سـورەتی (البقـرة)دا كاتێـك وەسـفی بـە یەكگەیـشتنی طـالوت و جـالوت دەكـات ، واتـە (بەیەكگەیـشتنی دوو لەشـكر: لەشـكری ئیمانـداران بـە سـەرۆكایەتی طـالوت و لەشـكری كافران بە سـەرۆكایەتی جـالوت)، جـا كـە دەگاتـە كۆتـایی چیرۆكەكە دەفەرموێ:

﴿قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُو اللّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ۝ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ۝ فَهَزَمُوهُم﴾ [1].

واتـه: (ئەوانـەی دڵنیـا بـوون بـە خزمـەتی پـەروەردگاریان دەگەن ووتیان: (مەترسن) چونکە چەندەها جار دەستەی کەم زاڵ بوون بەسـەر دەسـتەی زۆردا بـە فـەرمانی خـوا و خـوا یـار و یـاوەری خۆگر و ئارامگرانە ۝ وە کاتێك لە بەرامبەر جالوت و سـەربازانیەوە وەستان (نزایان کرد) ووتیان: پەروەردگارا خۆگری و ئارامگریمان پێ ببەخشە، (دڵ و دەروون) پێیـەکانمان دامـەزراو بکـە و سـەرمان بخـە بەسەر قەوم و هـۆزی بێباوەڕانـدا ۝ ئەوسا ئیتر بـە فـەرمانی خـودا لەشکری جالوتیان بەزاند).

ئینجا یەکسەر ئـەم ئایەتـە هـاتووە (فهزمـوهم) واتـە: ئەوسا ئیتر لەشکری جالوتیان بە فەرمانی خودا بەزاند).

بەڕاسـتی پەیوەنـدی یـەکی پتـەو لـە نێـوان سـەرکەوتن و ئارامگرتنـدا هەیـە، بـە خـوا ئـەم قورئانـە کاریگـەری زۆرە لەسـەر دڵەکان بەڵام...!

[1] سورة البقرة: ٢٤٩-٢٥١ .

تۆش ئەم ئایەتە بکە بە نزای بەردەوام و هەمیشەییت...
(پەروەردگارا خۆگری و ئارامگریمان پێ ببەخشە، (دڵ و دەروون) و پێکانمان دامەزراو بکە و بەسەر قوم و هۆزی بێ باوەڕاندا سەرمان بخە )

مەرجی ئێوە و مەرجی خوا

لە سورەتی (الانفال)دا خودای گەورە دەفەرموێ:
﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ﴾[1].

واتە: (ئەگەر بیست کەسی خۆڕاگر لە ئێوە هەبێت ، ئەوا زاڵ دەبن بەسەر دوو سەد کەسدا).

پاکی و بێ گەردی بۆ خودا...! ئەگەر مەرجی ئێوە سەرکەوتن بێت ئەوە مەرجی خواش ئارامگری ئێوەیە.

ئایا لە تاوان و کردەوەی ناشیرین ئارامدەگری ؟ ئایا لەسەر گوێڕایەڵی ئارامدەگری ؟ ئایا بۆ خوێندن و فێر بوون ئارامدەگری ؟ ئایا لەسەر گوێڕایەڵی دایك و باوك ئارامدەگری ؟ ئایا تۆ سووری لەسەر ڕەوشتی ئارامگرتن؟ ئایا...؟

هەرگیز ناتوانی هیچ مەرجێك دابنێی تا لە بەرامبەر ئەوە مەرجێکت لەسەر دانەنرێت...تۆ کە بۆ خوا ئارامت گرت خوداش هەر سەرکەوتنت پێ دەبەخشی...

---

[1] سورة الأنفال ،٦٥

ئایا کێ وەفادارترە: تۆ یان خودا...!؟ حاشا لە خودا.

**بۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەم ووشانەی هەڵبژاردووە؟**

دەبا لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بژین کە باس لە ئارامگرتن دەکات... پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((الصَّبْرُ ضِيَاءٌ)) [1]

واتە: (ئارامگرتن ڕووناکی یە).

دووبارە بیخوێنەوە و لێی ووردبەوە، بزانە لەبەر چی پێغەمبەرﷺ ووشەی (ڕووناکی) هەڵبژاردووە؟

چی دەبوو ئەگەر بیووتایە: (ئارامگرتن هێزە) یاخود (ئارامگرتن بەڵگەیە) یان (ئارامگرتن ورەیە)...

پێغەمبەرﷺ ووشەی (ڕووناکی) هەڵبژاردووە لەبەر ئەوەی تەنگوچەڵەمەکانی ژیان لە دونیادا چەند تاریکی یەکن لەوانە:

نەمانی دایك، نەمانی باوك، لە کیس چوونی ئەندامێك لە ئەندامەکانی لەش... ئەوانە هەمووی دڵتەنگی و خەمن کە مرۆڤ دەگەیەنێتە تاریکستانی و خەمۆکی و کوێربوون، وە هەروەها تاوان و گوناهەکانیش تاریکین، ئایا چ شتێك لە ناو جەرگەی تاریکییەوە بەدەردەکەوێت...؟ ڕووناکی... بەڵام چۆن ڕووناکی لە ناو تاریکی بەدەردەکەوێت...!؟ بە پێی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ئەو

[1] رواه مسلم في (الحديث: ٥٣٣)، والترمذي في (الحديث: ٣٥١٧)، وابن ماجه في (الحديث: ٢٨٠)، والإمام احمد في (الحديث: ٥\٣٤٢) .

ڕووناکییە ئارامگرتنە کە لەناو جەرگەی تاریکی غەم و خەفەت دەردەکەوێت و دەدرەوشێتەوە.

**ئاس ئەوە چ بەخشینێکە...!!!**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

(چ بەخشینێ نییە بدرێ بە هەر کەسێك چاکتر و باشتر بێت لە ئارامگرتن)[1].

ئێستا لە دڵەوە دەڵێی: (چاکترین شت لای من ئۆتۆمبێلەکەمە کە دوا مۆدیلە)... یان (سەروەت و سامانی وا و... وام هەیە...) یان (من لە شوێنی... ئیش دەکەم)... بە خوا چاکترین و خێرترین بەخشین کە پێت بدرێ ئارامگرتنە.

**لە کاری ئیمانداردا سەرت سوڕدەمێنێ...!**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (لە ئیش وکاری ئیماندارا سەرت سوڕدەمێنێ کە هەمووی هەر خێرە بۆی ئەگەر تووشی شکستی بێت ئارامی گرت ئەوە بە خێر بۆی گەڕاوە، وە ئەگەر تووشی خێر وخۆشی بێت شوکرانەی خوای کرد ئەوە هەر بە خێر بۆی گەڕاوە ، ئەوەش بۆ ئیماندار نەبێ بۆ کەسی تر نی یە) [2].

---

[1] رواه البخاري في (الحديث،١٤٦٩) و (الحديث، ٦٤٧٠)، رواه مسلم في (الحديث، ٢٤٢١)، والترمذي في (الحديث، ٣٥١٧)، وابو داود في (الحديث، ١٦٤٤)، والترمذي في (الحديث، ٢٠٢٤)، والنسائي في (الحديث، ٢٥٨٧)، واحمد في (الحديث، ٣\١٢) .

[2] رواه مسلم في (الحديث، ٧٤٢٥).

ئای چ ووشـەیەکە... دڵ ئارامـدەکات و دەخـورپێنێ... نـەفس دەکاتەوە...ووشەی (ئیماندار).

ئیمانـدارە لەکاتی نـاز و نیعمەتـدا سوژدەی شوکرانە بـۆ خـوا دەبات و سوپاسی دەکات، هەر ئیمانداریـشە لـە کـاتی تەنگانـە و گـیرو گرفت و ناخۆشیدا ئارامگرە و پشتی بـە خـودا بەسـتووە...( ئـەوە بـۆ ئیماندار نەبێ بۆ کەسی تر نیە).

**ئایا پێشتر بیرت لەوە کردۆتەوە...!!**

لە ناوە جوانەکانی خودا ناوی (الصبور) (بە ئارام) ئایا پێشتر بیرت لەوە کردۆتەوە...؟

ئەگـەر لـە ئارامگرتنـدا نـاز و نیعمـەت و شـکۆیی نـەبێ هـەر ئەوەنـدەت بەسـە کـە ناوێکـە لـە نـاوە جوانـەکانی خـوا... ، وە لەبەرئەوەی لە ناوە جوانەکانی خوایە ، ئێمەش خۆمان بەم ڕەوشـتە جـوان دەکـەین بـەڵام ئـەو هەسـتە پێویـستی بـە دڵێکـە کـە خـوای خۆشدەوێت و بۆی دەژی.

ووشەی ( الصبور- بە ئارام) پلە و پایەی بەرزترە لە (الصابر - ئارامگر) و (الصبار) ، ووشەی (الصبور- بە ئارام) مانای ئەوەیە کە بـارو وەزعەکـەی لەسـەر ئارامگرتنـدا درێـژەی پێـدراوە و بەردەوامـە لەسەری بەڵام ئارامگرتنێکە لەگەڵ ئـارامگرتنی ئـادەمیزادا جۆنیەك

نــين.. ئارامگرتنێكــه شايــسته و شــياوی مــهقام وگــهورەيی زاتــی (عزوجل)ه. خوایگهوره دەفهرموێ:

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾[1].

واته( هيچ شتێك نيه لهوێنهی ئهو زاته واته هيچ شتێك لهو ناچێت).

شهرم له خوا ناكهيت...؟!

ئهم فهرموودەيه بخوێنهرەوە... وە ئهگهر كاريگهری لهسهرت نهبوو، ئهوا بزانه كه خهوشێك له دڵتا ههيه...!!

پێغهمبهرﷺ دەفهرموێ:

(كــهس بــه قــهد خــودا خــۆڕاگر و بــه ئــارام نيــه لهســهر خراپهكاری و تاوان،... خودا كه شهريك و كوڕی بۆ دادەنرێت ، ئينجا پاش ئهوە تهندروستيان باش دەكات و لهش ساغيان دەكات و ڕزق و ڕۆزيان پێ دەبهخشێ) [2].

پاكی و بێگهردی بۆ تۆيه خودايه...

سهير كه...لهم ڕۆژگارەدا ڕێـژەی مـرۆڤ گهيـشتۆته ٦,٥ مليـار كـهس... ئايـا چـهنديان خـوا دەپهرسـتن...؟ چـهنديان يـادی خـودا

[1] سورة الشورى، ١١

[2] رواه البخاري في (الحديث، ٦٠٩٩) و (الحديث، ٧٣٧٨)، ومسلم في (الحديث، ٧٠١١) و(الحديث،٧٠١٣).

دەکەنەوە...؟ وە لە بەرامبەر ئەوەشدا چەندیان سەرپێچی خوا دەکەن...؟

لە هەندێك شەوانی ڕۆژەکانی ساڵدا هەر هەموو خەڵك نوقمی گوناه و تاوانن ، تەنها ئەوانەی خوا ڕەحمی پێ کردوون ، لەگەڵ ئەوەشدا ئارامیان لەسەر دەگرێ سزایان نادات و مۆڵەتیان دەدات.

بۆ شەرم لە خوا ناکەیت...تۆ وا ئارامت لەسەر دایکت یان خەسوت نیە چونکە... تۆ ئارامت لەسەر هاوڕێ و هاوپیشەکەت نیە چونکە...ئایا هیچ قسەیەك کارتان تێ ناکات...؟

(خوایە گیان دڵێکی بە تۆوە بەندی پاکی بێ خەوشی زیندوومان پێ ببەخشی).

## پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە خودایە!!

(هیچ ڕۆژێك نیە دەریا ئیزن لە خودا وەرنەگرێ وبڵێ: ئەی پەروەردگار ڕوخسەتم بدەرێ ئەوەی ئادەم نوقوم بکەم چونکە ئەوان ڕزق و ڕۆزی تۆ دەخۆن و غەیری تۆ دەپەرستن، چیاکانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگارا، ڕوخسەتم بدەرێ بەسەر نەوەی ئادەم خۆم تەبق بکەم و تەختیان بکەم چونکە ئەوان ڕزقی تۆ دەخۆن و غەیری تۆ دەپەرستن، زەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارا ڕوخسەتم پێ بدە نەوەی ئادەم قووت بدەم چونکە ئەوان ڕزق و ڕۆزی تۆ دەخۆن و

غەیری تۆ دەپەرستن، جا خوای گەورە و میهرەبانیش دەفەرموێ: ( لێیان گەڕێن و وازیان لێ بێنن ئەگەر ئەوانتان دروست کردایە ڕەحمتان پێ ئەکردن و بەزەییتان پێ دەهاتن)).

سەیرە... بوونەوەرو دروستکراوەکانی خودا ئارامناگرن... بەڵام سەیری خۆگری و ئارامی خودا بکە کە چۆن مامەڵە لەگەڵ بەندەکانی خۆی دەکات...

(خوایە گیان ئارامگر و خۆڕاگرمان بکەیت).

ئایا ئەوە ڕاستە...!؟

زاناکان دەڵێن: (ئارامگرتن نیوەی ئیمانە).

پاکی و بێ گەردی بۆ خودا... ئەوە چۆن...؟ ئەگەر هۆیەکەتان زانی...!!

ئیمان: واتە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خوا بیت و واز لە گوناهو و کردەوەی ناشیرین بێنیت، ژیانیشت یان ناز و نیعمەتێکە کە بۆت دێت وە یاخود دەرد و بەڵایەکە کە بەسەرتا دێت. گەر ناز و نیعمەتت بۆ هات ئەوا شوکرانە و سوپاسی خودا دەکەیت... ئەگەریش دەرد و بەڵایەکت بەسەردا هات ئەوا خۆت ڕادەگری و ئارام دەگری.

کەواتە ئارامگرتن نیوەی ئیمانە:

نیوەی یەکەم: شوکرانە و سوپاسگوزاریيە و نیوەکەی تریش: ئارامگرتنە.

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر ئیماندار لە کاتی خۆشی و شادیدا خوا بپەرستێ ئەویش بە: شوکرانە و سوپاس کردنی وە لە کاتی ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەشدا خوا بپەرستێ ئەویش بە: ئارامگرتن و خۆڕاگرتنە.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾[1].

واتە: (بە ڕاستی ئا لەو شتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ ئەو کەسانەی زۆر دان بە خۆدا دەگرن و زۆر سوپاسگوزارن).

خودای میهربان سوپاسگوزاری و ئارامگرتنی لەیەك ئایەتدا کۆکردۆتەوە، چونکە ئیمان بە هەردووکیانەوە کامڵ دەبێت...

**چاوەڕێی چی دەکەیت ئەگەر سەرت لێ بکرێتەوە...!؟**

پاکی و بێ گەردی بۆ خودا هەر دەڵێی ئیمان لاشەیە ئارامگرتنیش سەرەکەیەتی... بیرێك بکەوە ئەگەر سەرت لێ بکرێتەوە... ئینجا ئارەزوو و هەوەستێکت هەبوو ئەوە چی ئەنجام دەدەیت...!؟ ئاخر سەرت لێ کراوەتەوە واتە (ئارامت نی یە)، کەواتە بە هەوەسی خۆت چیت بوێت دەیکەیت...

[1] سورة لقمان، ٣١

ئەو كەسەی ئارامگر نەبێ ئیمانی نیيە

بەڵێ ئەگەر سەرت لێكرایەوە ئەوا دەمریت... ئارامگرتنیش بریتیيە لە سەر.

باشە...ئەی كوا ئیمان لە كوێيە؟!!

**بە شێوەیەكی جوان و چاك ئارام بگرە**

پاش ئەوەی گرنگی ئارامگرتنمان بۆ دەركەوت...ئێستا با بزانین شێوەی گونجاو و ویستراو لە ئارامگرتندا چۆنە...؟ خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿فَاصْبِرْ صَبْراً جَمِيلاً﴾[1].

واتە: (كەواتە خۆگر و ئارامگربە بە شێوەیەكی جوان و چاك).

هەروەها لە سورەتی یوسفدا پێغەمبەر یەعقوب دەفەرموێ:

﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾[2].

واتە (جا چارەم تەنها خۆگری و ئارامگرتنە بە جوانترین شێوە).

ئارامگرتنی چاك و جوان مانای چی یە؟

وە بۆ ووشەی (جوان) خراوەتە پاڵ (ئارامگرتن)؟

---

[1] سورة المعارج، ٥

[2] سورة یوسف، ١٨

ئارامگرتنی چاك و جوان ئارامگرتنێکە بە بێ بێزاری... بە بێ دڵەڕاوکێ... بە بێ دڵتەنگی...وە بە بێ بەهانە هێنانەوە... ئارامگرتنێکە بە زمان و بە دڵ نەك وەکو ئەوانەی کە بە زمان ڕازین و دڵیشی دەڵێ : ئەی خوایە بۆ و لەبەرچی؟

هەر کەسێك لە هەر کاتێك ئارامگرتنی زمانی لەگەڵ ئارامگرتنی دڵی بەیەکەوە بوون ئەوا ئەو کەسە ئارامگرە بە جوانترین شێوە.

ئەو کەسەش نیشانەی ڕازی بوون بە سەرو سیمایەوە دیارە بە بێ ئەوەی گرژو مۆن بێتەوە ، کە سەیریشی دەکەی هەر دەڵێی تووشی هیچ کارەسات و هیچ نەهامەتیەك نەبووە...بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێش و ئازاری دڵ و دەروونی وە فرمێسکی چاوەکانی فەرامۆش ناکات... ئەوەش لەبیر نەکەی کە ئێمە مرۆڤین.

ئارامگرتنی جوان و چاك مانایەکی تریش دەدا ئەویش ئەوەیە کە ئارامگرتنێکی گونجاو و باش و بەجێیە، بۆ نموونە: گەنجێك ناتوانێ ژن بێنێ ئینجا ئارامدەگرێ لە گوناه و حەرام و کردەوەی نالەبار...ئیدی چاوی دێنێتە خوارەوە نەزەر ناکات بەڵام لەهەمان کاتا ئیش ناکات و هەوڵ بۆخۆی نادات...کە ئەوەش ئارامگرتنێکی جوان وچاك نی یە، بەڵکو ئارامگرتنێکی نابەجێ و خراپە، ئارامگرتنی چاك و جوان ئەوەیە کە لە گوناه و تاوان ئارامبگری وە لە هەمان کاتیشدا ماندوو بیت و ئارەقە بڕێژی.

ئەکەی لە ماڵ دانیشیت و بڵێی: من ئارامم گرتووە... بەڵکو هەڵدەستێیەوە دەجووڵێیت وە کار و پیشە ئەنجام دەدەیت و ئارام دەگری...زۆربەی زۆرتان وا دەبینم کە ئارامگرتنێکی چاك و جوانی هەیە وایە!!؟

سەرنجێک

پاش ئەوەی ئارامگرتن و گرنگیمان زانی...ئینجا نموونەی ئەم بابەتەمان لە قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەریشدا دا خستەڕوو ، پاشان ناوی خوای پیرۆز (الصبور- بە ئارام)مان زانی...دواتر شێوازی ئارامگرتنمان زانی (ئارامگرتنێکی چاك و جوان).

ئایا دەزانی چۆن خودا (یارانی ناو ئەشکەوت )ی ڕزگار کرد؟ باشە ئاخر ئەوە چ پەیوەندییەکی بە ئارامگرتنەوە هەیە...؟

سێ یارانی ئەشکەوت خوا ڕزگاریانی کرد کە قەتیس بوو بوون لە ناو ئەشکەوتێکا... جا هەریەکەیان بە جیا نزا و پاڕانەوەی بۆ خودا کرد بەو کردەوە چاکە و پوخت و پاکەی کە لە ڕابردووی خۆیدا تەنها بۆ خوا ئەنجامی دابوو.

ئێستا تێگەیشتی مەبەستم چی بوو...دەی با بگەینە بەشی دووەم... ئارامبگرە با نیازت تەنها بۆ خودا بێت هەروەك یارانی ئەشکەوت.

## جۆرەکانی ئارامگرتن

١. ئارامگرتن لە تاوان و گوناهەکان.

٢. ئارامگرتن لەسەر بەلاّ و موسیبەتەکان.

٣. ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵییەکان.

### باشترینیان کامیانن...!؟

کەسانێك لە ئێمە هەن لە کاتی موسیبەتا بەهێز و خۆگر و نەبزێون، بەلاّم بۆ ئەنجامدانی گوناه و تاوان ئۆقرەیان نییە، کەسی تریشمان هەیە لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خودا ئارامگرە جا چ نوێژ بێت...چ ڕۆژوو...یان شەو نوێژەکان بێت بەلاّم بۆ تاوان و گوناه سەبری نییە، واتە: ( خوا پەرستە و بۆ خوا گوێڕایەلە ، بەلاّم ناتوانێ بەرگەی تاوان بگرێ و ئارامی نییە)... ئەومیان نموونەیەکی سەیرە... بەلاّم لەمە سەیرتر ئەو کەسەیە کە خوڕەوشتی بەرزە، بەلاّم نوێژی بەیانی ناکات !!!؟... هتد.

بەلاّم ئایا باشترینیان کامیانن...؟ باشترینیان ئەو کەسەیە کە هەر سێ سیفاتی ئارامگرتنی تێدا کۆ دەبێتەوە.

کاتی تەنگانە ئارامدەگرێت، لەسەر گوێڕایەڵی خودا ئارامدەگرێت وە لە گوناه و تاوانەکانیش دوور دەکەوێتەوە وئارامدەگرێ. ئا بەم جۆرە ئارامگرتنەکە تەواو و کامڵ دەبێت...

## پرسیار و وەڵام

### کام جۆری نارامگرتن لە پێشترە ...!؟

پ١: کامە جۆر لە پێشترە؟... ئارامگرتن لەسەر دەرد و بەڵاکان، یان لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خودا، یاخود لەسەر نەکردنی گوناه و تاوانەکان.

بیرێك بکەوە ئینجا وەڵام بدەوە...

و١/ ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خودا لە ئارامگرتن لە نەکردنی تاوانەکان لە پێشترە...ئەوە چۆن!؟ ئەی خۆ ئارامگرتن لەسەر دەرد و بەڵاکانیش گەورەن.

بەڵا و تەنگوچەڵەمەکان زۆر ناخۆش و زۆر سەختە...!!

بەڵام ئارامگرتن لەو کاتانەدا بە زۆرییە و ناچاری یە، بەڵام ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خودا وە پەیرەویکردن و بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی، وە هەروەها ئارامگرتن و خۆگرتن بۆ ئەنجام نەدانی تاوان و کردەوەی ناشیرین... ئەوانە هەمووی بە دەست خۆتە و بە ویستی خۆت هەڵیدەبژێری.

تێبینیەك: ئەو قوتابیەیەی کە لە تاقردنەوەکانی کۆتایی ساڵا دەردەچێ ئەو قوتابییەیە کە لە کاتی خوێندنا وە لە کاتی پێداچوونەوەدا...وە بە درێژایی ساڵەکە هەر تەنها بەخۆی وەڵامی

پرسـیارەکانی دەدایـەوە پاشـان جـەختی لەسـەر چـاو پیاخـشان و دووبارە سەیرکردنەوەی وەڵامەکانی دەکردەوە.

## کامیان قورسترە...!؟

پ٢/کامیـان قورسـترە؟ ئـارامگرتنی گـەورەمان یوسـف لـە هەڵبـژاردنی بەندیخانـە، یـاخود ئـارامگرتنی ئـەیوبی تـاقیکراو بـە نەخۆشی وە بە لێ سەندنەوەی ماڵ و سامان و منداڵەکانی.

و٢/ بێ گومان ئارامگرتنی یوسف، چونکە گەورەمان یوسف بە ویستی خۆی خرا بەندیخانەوە.

پ٣/ کامیان قورسترە؛ ئارامگرتنی گەورەمان یوسف لە تاریکی ناو بیرەکە یان ئارامگرتنی لە تەنگ و چەڵەمەی بەندیخانە ؟

و٣/ بێگومـان ئـارامگرتنی لـە ناخۆشـی بەندیخانـە... هەرچەندە تاریکی بیرەکە زۆر سەخت و بە ئازار بوو بەڵام بە دەست خۆی نەبوو بەڵکو براکانی خستی یانە نـاو بیرەوە ، بـەڵام سـەبارەت بـە بەندیخانـەوە ئـەوا بـە ویـستی خـۆی هەڵیبـژارد نـەوەکا لەگـەڵ خێزانـی عـەزیز تووشـی تـاوان و گـومرایی بێـت لەبـەر ئـەوە بەندیخانەی لا باشتر بوو وە لەوێ ئارامیگرت.

## کامیان بە پلە و پایەدارترە...!؟

پ٤/ ئێستا کامیان بە پلە و پایەدارترە؟... ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ خودا یاخود ئارامگرتن لە تاوان و سەرپێچی خوا؟

و٤/ زاناکان ڕای جیا جیایان خستەڕوو سەبارەت بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ، بەڵام لە دواییدا بەیەکەوە گەیشتنە دوا بڕیار بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەویش ئەوەیە کە ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی خودا بەرزتر و گەورەترە لە ئارامگرتن بۆ نەکردنی تاوان و گوناهەکان. گەر تۆ لەسەر گوێڕایەڵی خودا خۆت لێ ڕاهێنا و ئارامت گرت ، ئەوە پایەدارتر و بەرزترە لە ئارامگرتن بۆ نەکردنی تاوان و گوناه...باشە ! بۆچی...!؟

ئاگاداربە: ئەوە بانگەواز نی یە بۆ ئەنجامدانی تاوان و گوناه... بەڵام لە مەبەستم تێبگە...!

١- خوای گەورە بۆ پەرستنی ئەو وە بۆ ناسینی زاتی خۆی دروستمانی کردووە ، خواپەرستن و ناسینی زاتی موبارەکی بە گوێڕایەڵی کردن جێبە جێ دەکرێ.

٢- خوای گەورە هەر چاکەیەکی بە (١٠) بۆ حیساب کردووین بەڵام خراپە بە قەد خۆی نە زیاد نە کەم... واتە چاکە لای خودا خۆشەویستە و پاداشتەکەشی بە زیادەوەیە.

٣- ئەگـەر كەسـێك لـە ڕۆژی قیامەتـدا گوێڕایەڵییـەكانی بـۆ خـودا یەكسان بوو بە تاوانەكانی ئەوا خوای گەورە دەفەرموێ (ڕەحمەت و بەزەییم پێش ڤین و تووڕە بوونم كەوتووە)...

كەواتە ئێستا ئـارامگرتن لـە گوێڕایـەڵی خـودا لـە ئـارامگرتن بـۆ نەكردنی گوناھ و تاوانەكان گەورەترە پاشان ئارامگرتن لەسەر بەڵا و موسیبەتەكان كە بە پلەی سێیەم دێت.

**دەی ئێستا بۆ ڕیزكـردنی ڕاست...**

١- ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی یەكان.

٢- ئارامگرتن لەسەر نەكردنی تاوان و گوناھەكان.

٣- ئارامگرتن لەسەر بەڵا و نەھامەتی یەكان.

نزیك بـوان لـە خـودا ﴿المقـرّبین﴾ پلـە و پایـەی زۆر بـەرز و گەورەیان ھەیە...بەڵام وەی بۆ پێشكەوتووان ﴿السابقون﴾ .

یەكەم جار دەست دەكەین بە باسی ئـارامگرتن لـە كـاتی دەرد وبەڵاكان ، ئینجا لە گوناھ و تاوانـەكان، پاشـان بـە ئـارامگرتن لەسـەر گوێڕایەڵی كۆتایی بە باسەكەمان دێنین.

## جۆری یەكەم: ئارامگرتن لەسەر دەرد و بەڵاكان

نموونە زۆرە بۆ ئەم جۆرە ئارامگرتنە و تاقی كردنەوەكانیش زۆرن. بۆ نموونە مردنی كەسێكی نزیك ، نەخۆشكەوتنی جۆراو جۆر كـە كۆتـایی نایـەت،... ھـەژاری و بـێ دەرامـەتی...دواكـەوتنی

منداڵەكانمان لە قوتابخانە و سەرنەكەوتنیان... وە هەروەها چەندەها گیروگرفتی خێزانی و كۆمەڵایەتی و... و...

مردن ، نەخۆشی ، هەژاری ، سەرنەكەوتن ، گیروگرفتەكانی ناو خێزان و...و... ئەم تاقیكردنەوانە زۆرن، بەڵام دەتوانین هەندێكیان باس بكەین ، بۆ نموونە مردنی كەسێكی نزیك؛ بێ گومان ئەم جۆرە تاقیكردنەوەیە بۆ ئافرەت سەختترە هەرگیز ئافرەت بە مردنی خۆشەویستان زیاتر ئێش و ئازار دەچێژێ وەك لە پیاو.

پەرژینێك لە نێوان ئەو و ئاگری دۆزەخ...

ئافرەتان بە پێغەمبەریان (صلی الله علیە وسلم) گوت: پیاوەكانمان لە بینینی تۆ سەرقاڵیان كردووینە ئەی نێردراوی خودا (صلی الله علیە وسلم) ،لەبەر ئەوە بە خۆت ڕۆژێكمان بۆ دانێ بێیتە لامان، پێغەمبەریش(صلی الله علیە وسلم) فەرمووی: (بەڵێ، باش) ئینجا لە ڕۆژی دیاریكراو هاتە لایان قسەی لەگەڵیان كرد و ڕێنمایی كردن وە لەو قسانەی كە كردی فەرمووی: (كێ لە ئێوە سێ منداڵی لێ مرد، ئەوا پەرژینێك لە نێوان ئەو دایكە و ئاگری دۆزەخ دروست دەبێت) ئینجا ئافرەتێك ووتی، گەر دووانیشی لێ بمرێ ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (ئەگەر دووانیشی لێ بمرێ).

پاكی وبێ گەردی بۆ خوا! چ دایكێك سێ یان دوو منالی بمری... پاداشتەكەی پەرژینێكە لە نێوان ئەو دایكە و ئاگری دۆزەخ...گوێم لێتە دەلێی: ئەوەی دەستی ناو ئاوە وەك ئەوە نییە كە دەستی ناو ئاگرە...یان دەلێی: ئاخر تۆ جەرگ سووتانت نەبینیووە... بەلێ قسەكەوت ڕاستە... بەلام توخوا گەر ئەوە پاداشتت بێت ئارامناگری...؟!

## خانووی سوپاسگوزاران بۆ تۆیە ئەی نارامگرەكە

ئەم فەرموودەیەش بۆ دایكان و باوكانە... پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ئەگەر منالی موسولمانێك مرد، ئەوە خودا بە فریشتەكان دەفەرموێ: ڕوحی ئەو منالەیتان كێشا ! ئەوانیش دەلێن: بەلێ .دەفەرموێ: جەرگتان بڕی! دەلێن: بەلێ، جا دەفەرموێ: ئەو بەندی من چی فەرموو؟ ئەوانیش دەلێن: سوپاس و ستایشی كردی و گوتی گەڕانەوەمان هەر بۆ لای تۆیە خودایە: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾[1]. ، خواش دەفەرموێ: ( دە بڕۆن خانووێك لە بەهەشت بۆ ئەو بەندەم دروست بكەن و ناوی نێن خانووی سپاسگوزاران)[2]...

---

[1] البقرة، ١٥٦.

[2] رواه الترمذي في ( الحديث،١٠٢١)

ئەگەر منالێکت مرد ، تۆش یەکسەر بەبێ بێزاری و دڵتەنگی سوپاس و ستایشی خودات کرد گوتت ئێمە موڵکی خوداین تەنها هەر بۆ لای ئەو زاتەیە گەڕانەوەمان... ئەوا خانووی سوپاسگوزارانت پیرۆز بێت.

کەسانێك وا گومان دەبەن کە لەو کاتانەدا (مردنی نزیکەکان) هەست و سۆزەکان پێچەوانە دەبنەوە... بەڵام من دەڵێم تۆ ناتوانیت ئەمە ئەنجام بدەیت ئەگەر ئیماندارێکی خۆگر و نارامگر نەبیت.

## ئایا بەهەشت بۆ کێ یە...!؟

ئەم فەرموودەیە بانگەوازێکە بۆ هەموومان... پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ:

(خوای گەورە فەرموویەتی : ئەگەر کەسێکی ئازیز وخۆشەویستم لە بەندەی خۆم سەندەوە لە دونیا وە ئەویش سەبر و نارامی لەسەر گرت ئەوا ئەو پاداشت و جەزایەی کە بۆ ئەو بەندەم داناوە ئیلا و تەنها بەهەشتە)[1]

هەر کاتێك مرۆڤ لە دونیا خۆشەویستێکی لێ مرد جا ئەگەر برای بێت خوشکی بێت، باوکی یان دایکی بێت ، یاخود هاوڕێیەکی

[1] رواه إمام احمد في (الحديث: ٩٦٣٢). ( له كتاب نووسراوه رواه البخاري في (الحديث: ٦٠٩٩) بەڵام راستیەکەی ئەوەی کە ئێمە نووسیمانە)

خۆشەویستی بێت یەکسەر ئارامی گرت وە داوای پاداشت و ئەجری لە خوا کرد ئەوا بەهەشتی خوای بۆ زامن دەکرێت.

خوایە گیان لە ئارامگرانمان حیساب بکەی.

**قەڵەم ناتوانێ بینوسێ... !**

بە پێداچوونەوەی ئەم سێ فەرموودەیەی پێشوو سەیردەکەی ئەوەی کە بە مردنی کەسە خۆشەویستەکانی ئارامی گرتووە پاداشتی ئەمانەی خوارەوەیە،

( پەرژینێك لە نێوان خۆی و ئاگر، بەهەشت، خانووی سوپاسگوزاران)...

ئای چ خۆشی یەکە بۆ ئەو کەسەی کوڕێکی یان برایەکی یان هاورێ یەکی نزیکی مردووە و ئارامی گرتووە... ئیتر ئەو دەستی دەگرێت و بەیەکەوە دەچنە ناو بەهەشتەوە...

گوێم لێتانە دەڵێن، (قەزا و بەلا دوور)... (خوایە لێمان دوور بێ)...!! مەبەستم ئەوە نی یە... هەر لەبەر ئەوەیە دەڵێم خام ناتوانێ بینووسێ... بەلام هەست ناسکی و دڵی ئیماندار لە مەبەستم تێدەگا.

**کاتی نەخۆشی...**

تاقی کردنەوەیەکی تری خوا بۆ بەندەکەی تاقی کردنەوەی نەخۆشی یە... کەسانێك گیرۆدەی دەست ناتەواوی لەش و لاوازی

گورچـیلەکانیەتی، هەنـدێکی تـر گرفتـاری نەخۆشـیەکانی دڵ و نەخۆشی یـەکانی دەروونـین وە هـەروەها... خـودا شـیفای هـەمووتان بدا و چاکتان کاتەوە... نەخۆشی تاقیکردنەوەیەکی سـەختە و گرانـە پێویستی بە ئارامگرتنێکی جوان و چاك هەیە، وانی یە!؟

ئەم فەرموودەیەی خوارەوە بخوێنەرەوەو... نیازی دڵت نـوێ بکەوە...وە کەش و دۆخێکی ئیمانی بۆ خۆت دروست بکە...

## چۆن ئەو پلە و پایەی وەرگـرت...!؟

عطائي کوڕی ڕەبباح دەڵێ: کوڕی عەبباس پێی وتم: دەتـەوێ ئافرەتێکی خەڵکی بەهەشتت پـێ پیشان بـدەم: منـیش گوتم: بـەڵێ، گوتی: ئەو ئافرەتە ڕەش پێستەیە کە هاتە لای پێغەمبـەر(صلی الله علیه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا پەرکەمم هەیە و هەر کە دەمگـرێ جـل لەبـەر خـۆم دەکەمـەوە لاشـەم بەدیاردەکـەوێ ، ئـەی پێغەمبـەری خـودا دوعـا و نـزام بـۆ بکـە ، پێغەمبـەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (گەر بەم حاڵەوە ئـارامتگرت ئـەوا بەهەشـت بـۆ تۆیـە، ئەگـەریش ویـستت داوا لـە خـودا دەکـەم کـە شـیفات بـدا وچاکت کاتەوە).

ئافرەتەکـە ووتـی: ئارامـدەگرم بـەڵام کـە دەمگـرێ جلـەکانم دەدرێنم و لەبەر خۆمی دەکەمەوە لاشەم دیاردەکـەوێ، لـە خـودا داوا بکە کە وا نەکەم و چیتر عەوراتم دەرنەکەوێ، پێغەمبـەریش(صلی

الله عليـه وسلم) دوعـاى بـۆ كـرد ئـيتر پـاش ئـەوە هەركـە پەركـەم دەيگرت دەكەوت بەڵام عەورەت و لاشەى دەرنەدەكەوت.

لەو ئافرەتـەى...!! كـە زانـى ئـارامگرتن بەرامبـەر بەهەشـتە بەهەشتى هەڵبژارد بەرامبەر ئارامگرتنەكەى.

ئەگەر تۆ لە شوێن ئەو بوويتايە وەڵامت چى دەبوو...!؟

دە تــۆش خوشــكى ئــازيز و شــيرينم... ســەيرى حــەيا و حورمەتى ئەم ئافرەتە بكە، ئـەو لـە كاتى پەركـەمگرتن شـەرمى بـە خۆيە كە لەش و گيانى بەدياردەكەوێت... ئەى چى بەوانە دەڵێى كە بە ويستى خۆيان لەشيان پيشان دەدەن و دەرى دەخەن...

ئايا سوودت لێ وەرنەگرت!؟

**ئەى ئەوەى چاوە خۆشەويستەكانى لە دەست دەدا...!؟**

خواى پاك و بێگەرد لە فەرموودەيەكى قودسى دا دەفەرموێ:

(ئەگـەر بەنـدەيـەكم هـەردوو چـاوە خۆشەويـستەكەيم لـە دونيـا لێ سـەندەوە و ئـەويش لەسـەرى ئـارامى گـرت، ئـەوا بـە بـە هەشـت قەرەبووى دەكەمەوە)

ســەيرى ئــەم وەســفە بكــە: دوو چــاوە خۆشەويــستەكەى (هەردوو چاو خۆشەويسترين ئەنـدامن لـە لەشـى مرۆڤـدا) ، هەسـت دەكـەيت ئـەو تـاقى كردنەوەيـە قـاڵبێكى پـڕ لـە ڕەحمـەت و بـەزەيى يە...

بەڵام کێیە ئەوەی ئارامدەگرێ...؟!

## لەرز و تا گوناهەکانی پێشوو لا دەبات!!

جابری کوڕی عەبدوللا گوتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) چووە سەردانی ماڵی دایکی سائیب فەرمووی: (ئەوە چیتە دایکی سائیب ! لەرزت لێ یە) ئەویش گوتی: ئەوە تایە تا دەك بەرەکەتی خوای تیا نەبێ، ئەویش فەرمووی: (توانج و جنێو بە تا مەدە چونکە لەرزوتا گوناهی ئادەمیزاد لا دەبات و دەیوەرێنێ، وەك چۆن دەمە کوورەی ئاسنگەری ژەنگ و پیسی ئاسن لا دەبات).

تویەیەک: هەندێك جارلە کاتی نەخۆشیا لە تاو ئێش و ئازاری ئەو نەخۆشی یە دەناڵێنی و دەگری، بەڵام چێژ و لەززەتێك لە دڵ و دەروونتا دروست دەبێت کە ئەو چێژ و لەززەتە ئارامی وخۆگرییە، بەڵام هەست کردن بە ئەجر و پاداشتی ئەو ئارامی‌یە تام و چێژێکی زیاتر و گەورەتریشی هەیە...لەو کاتەی وا ژان و ژور دەتگوشێت ، تۆ تام و لەززەت لە پاداشتەکەی دەکەیت وە هەست بە هەڵوەرینی گوناهەکانت دەکەیت...

ئایا هیچ پێشتر هەستت بەو قسانە کردووە...؟!

ئەم وتەیەی ئیبن مەسعود

چ کاریگەرییەکی لەسەرت هەیە...؟

کوڕی مەسعود وتەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێ: (دەرد و موسیبەت هیچ چاکەیەکت بۆ زیاد ناکات تا بۆت بنووسرێت). ئەوانەی دەوروبەری بەم وتەیە زۆر دڵتەنگ بوون، چونکە وایان دەزانی کە دەرد و بەڵاکان چاکەی هەیە و بۆت دەنووسرێت. کوڕی مەسعودیش یەکسەر وتی: (بەڵام ئەو دەرد و موسیبەتانە گوناهەکان لادەبات)، ئەوجا دڵیان خۆش بوو بەم قسەیە...

بەڵام ئەوە بۆ کەس نیە بۆ ئیمانداری بەسەبر و ئارامگر نەبێ.

## ووتەیەک لە دڵەوە

یەزیدی کوڕی مەیسەرە یەکێکە لە شوێنکەوتووان (التابعین) کە ووتەیەکی زۆر جوانی هەیە دەڵێ: (لەو کاتەی کەسێك تووشی نەخۆشیەك دەبێت، ئەوا هیچ خێر و چاکەیەکی نابێت تا خوا بۆی بنووسێت، ئینجا خوای گەورە شتێك دەخاتە دڵی یەوە و بانگی دەکات پێی دەڵێ: ئەی بەندەکەم بگەڕێوە لام ، ئەویش لەو کات کە بە ژان و ئازارەوەیە، بە فرمێسکی چاوەکانی تکا لە خوا دەکات و داوای ڕەحمەت و بەزەیی لێ دەکات،... ئیتر تا دەگاتە ئەو کاتەی کە لە نەخۆشیەکەی دەردەچێت، هیچ گوناهێکی لەسەر نامێنێت و پاك دەبێتەوە).

ڕاستە هەر ووتەیەك كە لە دڵەوە دەربچێت ناچێتە هیچ شوێنێكی تر تەنها دڵ نەبێ... ئەوانە چەند ووشەیەكن نەك تەنها گەیشتۆتە دڵ بەڵكو شیرینی و ڕاستی ئەم وشانە چاوەكان فرمێسكی بۆ باراندووە و گیان بۆی پاك بۆتەوە.

**پێغەمبەری خوا لەسەرتی ئاسان كردووە**

پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) لە یەكێك لە شەڕەكان پەنجەیەكی زۆر بە قووڵی برینداردەبێت ،جا سەیری پەنجەكەی دەكات و دەفەرموێ: (ئەی تۆ ئەو پەنجەیە نی كە لە پێناوی خوا خوێنت لێ هاتووە و وات بەسەر هاتووە).

پاكی و بێ گەردی بۆ خوا...! بینینی خوێنی خۆت لە كاتی بریناربوون و خوێنبەربووندا دەتشڵەژێنێ... بەڵام سەیری پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بكە كە چۆن ئارامت دەكا و لەسەرت ئاسان دەكات.

هەر لەبەر ئەوە یەك لە نزاكانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بۆ نەخۆش ئەوەیە: (هیچ نیە پاك بوونەوەیە لە گوناە بە ئیزنی خوا). (لا بأس طهور إن شاءَ الله)،

وە لە كاتی سەردانی نەخۆشدا سوننەتە بە نەخۆشەكە بڵێی : هیچ نیە پاك بوونەوەیە لە گوناە بە ئیزنی خوا.

(كەسانی چاكەكار با هەڵسنەوە سەرپێ)...!!

وه له ئارامگرتن له بـه‌لا و ناخۆشـیـیه‌کان... ئارامگرتنـه لـه‌و کاته‌ی خه‌ڵك ئـازارت ده‌ده‌ن... ئـارامگرتن له‌سـه‌ر هاوسـێکه‌ت کـه بـه زمـان برینـدارت ده‌کـات، ئـارامگرتن له‌ســه‌ر خه‌سـوو و خـه‌زوور کـه به‌ڕه‌قی مامه‌ڵه‌ت له‌گه‌ڵ ده‌که‌ن... ئارامگرتن له‌سه‌ر پیاوه‌که‌ت ئه‌گه‌ر خراپ بێت... خۆڕاگرتن به‌رامبه‌ر قسه‌یه‌کی ناخۆش لـه باوکتـه‌وه... ئایا ده‌توانی خۆت بگریت به‌رامبه‌ر ئه‌و قسه ڕه‌قانه و به‌رامبه‌ر ئـه‌و مامه‌ڵـه بـه‌ئازاره‌کانی کـه له‌گـه‌ڵت ئـه‌نجام ده‌دریٚ وه بـه هـه‌موو شـێوه‌کانی‌یه‌وه بـه تایبـه‌تی به‌رامبـه‌ر ئـه‌و که‌سـانه‌ی کـه خۆشـیان ناوێیت و حه‌ز له سـیمات ناکه‌ن یـان له‌گـه‌ڵ ئه‌وانـه‌ی دوژمنایـه‌تیت ده‌کـه‌ن؟ ئایـا ئارامـده‌گری؟... پێغه‌مبـه‌ر (صـلی الله علیـه وسـلم) ده‌فه‌رمویٚ: ( له‌و کاته‌ی وا هه‌موو بوونه‌وه‌ر و دروستکراوه‌کانی خودا له ڕۆژی قیامه‌تا کۆکراونه‌ته‌وه ، بانگده‌رێك بـانگی که‌سـانێك ده‌کـات و ده‌ڵێت: با که‌سانی فه‌زڵ و چاکه‌کار هه‌ڵسنه‌وه سـه‌ر پیٚ، ئـه‌وانیش هه‌ڵده‌سـتنه‌وه کـه ژماره‌یـان که‌مـه، ئینجـا زۆر بـه په‌لـه خێـرا بـۆ به‌هه‌شـت ڕاده‌کـه‌ن ، فریـشته‌کانیش لـه ڕێگـا ڕایانـده‌گرن و پێیـان ده‌ڵـێن: ئێـوه کـێن؟ ئـه‌وانیش ده‌ڵـێن: ئێمـه که‌سـانی چـاکه‌کارین، ئه‌وانیش ده‌ڵێن: چاکه و فه‌زڵتان چی یه؟ ئه‌وانیش ده‌ڵێن: لـه دونیـا ،که سته‌مـان لیٚ ده‌کرا ئارامـمان ده‌گرت، که ئازار ده‌درایـن لـیٚ خـۆش ده‌بووین، که به نه‌زانی هه‌ڵسوکه‌وتمان له‌گه‌ڵ ده‌کرا ئارامـمان ده‌گـرت

و لەسەرخۆ دەبووین، ئەوجا فریشتەکان پێیان دەڵێن: دە بچنە بەهەشتەوە کە چاکترین پاداشتی کارگوزەرەکانە.

ئێستا ئارامدەگری... یان تۆڵە بە تۆڵە و ئازار بە ئازار...

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾[1].

واتە: (لە ڕاستیدا ئەوەی دان بە خۆیدا بگرێت و چاوپۆشی بکات و لێ خۆشبوو بێت (لە کاتێکدا کە دەتوانێت تۆڵە بە تۆڵە بسێنێت) بە ڕاستی ئەوە کارێکی چاك و پەسند ئەنجام دەدات، بەڕاستی ئەوە لەو کارانەیە کە پێویستە بکرێت).

**خودا ڕەحمی بە موسای برام کرد... !!**

کوڕی مەسعود دەفەرموێ: لە ڕۆژی حونەین، کاتی بەش کردنی غەنیمەت و پارە و ئازوقە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەڵکانێکی پەسند کرد بەسەر ئەوانی ترا، بەشی زیاتری دانا بۆ سەرپەرشتیاران و گەورەپیاوانی عەرەب، پیاوێکیش گوتی: بە خودا ئەم بەشکردنە دادوەری تیا نییە و لەبەر خاتری خودا نەکراوە، منیش گوتم: بە خوا ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر ڕادەگەیەنم، ئینجا چوومە لای پێغەمبەر و هەواڵەکەم پێ گەیاند، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) یەکسەر سیمای دەم و چاوی گۆڕا و فەرمووی

[1] سورة الشورى: ٤٣

(صلى الله عليه وسلم)، (ئەگەر خودا و پێغەمبەری خوا دادوەری نەکەن ئەی کێ دادوەری دەکات؟) پاشان فەرمووی، (خودا ڕەحمی بە موسای برام کردووە ،کە ئەو لە من زیاتر ئازاردراوە و هەر ئارامیگرتووە) ئەوسا منیش گوتم، مەحاڵە جارێکی تر هیچ قسە و هیچ هەواڵێکی تر بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگێڕمەوە.

باشە گەر ئەم هەلوێستە بەسەر تۆ هات ، گەر ستەمت لێکرا و تاوانبار کرایت... توخوا چی وەلام دەدەیتەوە... گوێ بگرە و فێر بە...!

گەر دەتانەوێ فێری ئارامگرتن بن ئەوا پەیڕەوی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بکەن...وە ئەگەر دەتانەوێ لەسەر قسە بە ئازارەکانی خەڵك ئارامبگرن ئەوا ئەم ئایەتەی خوارەوە تێبگە:

﴿وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيراً﴾[1].

واتە:(ئێمە هەندێك لە ئێوەمان کردۆتە هۆی تاقیکردنەوەی هەندێکی ترتان... ئایا خۆدەگرن و خۆڕاگر دەبن، بێگومان پەروەردگاری تۆ هەمیشە و بەردەوام بینایە بە هەڵسوکەوتی بەندەکانی).

بە کورتی...!!

---

[1] سورة الفرقان: ٢٠

بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئەوەی بە ئارامبی لەسەر هەموو شتێك کە تووشی دەبیت و دووچاری دەبیتەوە ، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بخوێنەوە کە دەفەرموێ: (گەر موسڵمان تووشی هەر شتێك بێت ،جا چ ماندوو بوون چ دەرد ونەخۆشی ، وە چ غەم و پەژارە و ئەشکەنجەو ئازار ئەوانە هەر هەمووی ، هەتا ئازاری ئەو دڕکەی کە دەچێ بە لەشدا ئیلا و هەر خوا بەوە لێی خۆش دەبێت وە گوناهەکانی پێ لادەبات).

کاتی ماندوو بوون و شەکەتی بۆ نموونە پاش یاری تۆپی پێ ماندوو دەبیت ، ئەو ماندوو بوونە بێگومان مایەی چاو پۆشی و لابردنی گوناهەکانتە (ئەوە بە مەرجێك گەر نیازی یاریکردنەکات بۆ خوا بێت کە بە نیەتی ساغی و سەلامەتی لەشت وەرزش بکەیت بۆ ئەوەی لەشت بەهێز و پتەو بێت)، ( چونکە بە ڕاستی ئیمانداری بەهێز و بە توانا لای خودا چاکتر و باشتر و خۆشەویستترە وەك لە ئیمانداری تەپیوی بێ هێز )...

هێشتا وا زیندووی و گوێ دەگری بەڵام...!!

لێرەدا مەبەستم زیندوویی دڵەکانە...هەر کەسێك هەموو لەم شتانەی کە لەوەوپێش باسکران کاری تێ نەکرد و کاریگەری لەسەری نەبوو، وە یان لێی تێ نەگەیشت... وە ئەوەی بە تەواوی بڕیاری لەسەر خۆی نەدا کە ئارامبگرێ...

چی پێ بڵێم...؟!

وه ئهگهر سووری لهسهر جێ بهجێ کردنی ڕهوشتی ئارامگرتن ، ئهم فهرموودهیهی خوارهوه بخوێنهوه:

پێغهمبهر(صلى الله عليه وسلم) دهفهرموێ: (بهردهوام دهرد و بهڵاو ئهشکهنجهو ئهزیهت لهگهڵ ئیمانداراندایه له لاشهی و له سامانی و له منداڵی ههتا وای لێ دێت بهخزمهتی خوا دهگات، یهك گوناهیشی لهسهر نهماوه).

گهر تۆش دهتهوێ بگهیته خزمهت خوا و هیچ گوناهێکت لهسهر نهمێنێت...ئهوا پێویسته ئارامبگری...

## خوایه کیان لهوانمان دانهنێیت...!!

جۆره کهسانێك ههن...دوژمنانی خودان، که کهسانێکن خودا ڕق و قین و خهشمی خۆی لێ ههڵگرتوون وه به هیچ شێوهیهك تاقییان ناکاتهوه، بهڵکو خێر و خۆشی و ناز و نیعمهتیان بهسهردا دهڕژێنێ وه خۆشگوزهرانییان بۆ زیاد دهکات ههتاکو دهیانباتهوه لای خۆی، جا ئهو کات ڕزگاریان نابێ، خوای گهوره باسی ئهم جۆره کهسانه دهکات لهم ئایهتهدا که دهفهرموێ:

﴿حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ﴾[1].

---

[1] سورة الانعام ، ٤٤

واته:(هەتا کاتێك دڵخۆش و شادومان بوون بەوەی پێیان درا، ئیتر لە ناکاو گرتمانن و هەموویانمان سەرگەردان و ڕیسوا کرد ئینجا ئەوان بێ ئومێد بوون و بە غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە تیا چوون).

بە هەڵەدا نەچی بڵێی: (خوایە تاقیمان بکەوە)...بەڵکو ساغ و سەلامەتی ئایین و دونیات لە خوا داوا بکە...

**ئەوانە کێن کە لە هەموو خەڵك زیاتر تووشی ئەشکەنجەو ئازار دەبن... !؟**

لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پرسیار کرا: ئەوانە کێن کە بە زۆرترین بەلاّ و موسیبەت تاقیدەکرێتەوە؟ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەو کەسانەی کە لە هەموو خەڵك زیاتر تووشی ئەشکەنجە و ئازار دەبن پێغەمبەرانن، پاشان ئەوانەی کە لێیان نزیکن لە ئەولیاو پیاوچاکان، ئینجا مرۆڤ کە بە قەدەر ئیمانی تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر ئیمانەکەی بەهێز ودامەزراو بێت ئەوا بەلاّکانی لەسەر زیاتر و گەورەتر دەبێت، وە ئەگەر ئیمانەکەی لاواز بوو ئەوا بە پێی ئیمانەکەی تاقی دەکرێتەوە).

وا مەزانە کە تەنها تۆی تاقی دەکرێیتەوە... پێغەمبەران لە هەموو کەس زیاتر تاقیکراونەتەوە وە بە سەختترین شێوە ، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان هەر ئارامیان گرتووە...

ئەم دەستەواژەیە دووبارە بخوێنەوە (مرۆڤ بە پێی پلەی ئیمانی تاقی دەکرێتەوە)...

وابزانم لەوەودوا ڕازی دەبیت بە قەزا و قەدەری خوا...ئیتر بە جوانی و چاکی ئارامدەگری.

## حیکمەت لە تاقیکردنەوە ناخۆشەکاندا چییە...!؟

کەسانێك دەپرسن... لەبەر چی خودا تاقیمان دەکاتەوە؟ ئایا حیکمەت و سوودی ئەم تاقیکردنەوانە چین؟

پێش ئەوەی وەلاَم بدەمەوە بیرێك لەم چەند ووشەیەی خوارەوە بکەرەوە:

هەندێك لە هاوەلاَنی پێغەمبەر ئەوەندە بڕوایان بەهێز و پتەوبووە هەتا ئەگەر پەردە لەسەر هەندێك شتی ئایندەی غەیبی نەزانراو لادرایە و ئاشکراش کرابا ئەوا هیچ لە دڵنیایی و یەقینیانی زیاد نەدەکرد.

ئەگەر وریا ودانا بیت هەر بە هێما سەرنج دەدەیت و تێدەگەیت...!

## حیكمەتی یەكەم: بەرزبوونەوەی پلە و پایە

خوای گەورە بە ناخۆشییەكان تاقیمان دەكاتەوە بۆ ئەوەی پلە و پایەمان بەرز بكاتەوە...(ئەگەر هاتوو ئیمانەكەی پتەو و دامەزراو بێت ئەوا تاقی كردنەوەكانی بۆ زیاد دەكات)...دە بیرێك بكەنەوە گەر بەبێ بەلاَ و بەبێ موسیبەت ژیانمان بردەسەر ئەوا بە دەست بەتاڵی و بە مایە پوچی دەگەینە خزمەتی خوا... نەكەن وا هەست بكەن كە كردەوە چاكەكانمان دەمانگەیەنێتە ناو بەهەشت...!! نەخێر..!!

جاروبار بەڵایەك دێت هەفتەیەك درێژە دەدا و دەرگات لەسەر دادەخا... جا دەگاتە مانگێك...هەندێ جار دەگاتە ساڵێك، دوو ساڵ... لەو كاتەدا پلە و پایەت بەرز دەبێتەوە و خوا پارمەتیت دەدا... جا بۆ ئەوەی بگەیتە ئەم ئاست و پلە و پایەیە ئەوا ئەو بەلاَ و تاقی كردنەوانە بۆ تۆ پێویستن و هەر دەبێ ببێ.

## حیكمەتی دووەم: جیاكردنەوەی پلە و پایەكان

وە هەروەها حیكمەت لە تاقیكردنەوە ناخۆشەكان... جیا كردنەوەی پلە و پایەكانە، خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنْكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ﴾[1].

---

[1] سورة آل عمران، ١٤٢

واتـە: (یـان وا گومانتـان دەبـرد (هـەروا بـە ئاسـانی) دەچـنە بەهەشتەوە؟! کە هێشتا خوا (لە جیهانی واقعدا) دەریشی نەخستووە کامتـان هـەوڵ و کۆشـش و جیهـادی کـردووە و کامتـان خـۆڕاگرە و ئارامگر بووە...) [1].

وە هەروەها دەفەرموێ:

﴿مَا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ﴾[2].

واتە: (خوا ئیمانداران واز لـێ ناهێنێـت هـەروەکو ئـەوەی کـە ئێستا ئێـوە لەسـەری هـەن (دڵسۆز و نـا دڵسۆز خـەمخۆر و بـێ بـاك تێکەڵن)، هەتا پـیس و پـاك لەیـەك جیـا نەکاتـەوە (بـەهۆی جۆرەها تاقی کردنەوە و پێشهاتەوە)، بێگومـان خوا جیهانی شـاراوەتان نیـشان نادات (تا ئاییندە بزانن)) [3].

چ حیکمەتێکی خواییە...کەسانی فەزل و چاکە جیـا کرێنـەوە لە کەسی سەرشۆڕ و ڕیسوا.

**حیکمەتی سێ یەم: هەتا تووشی لووت بەرزی نەبیت...!!**

---

[1] تەفسیری ئاسان

[2] سورة آل عمران: ١٧٩ .

[3] تەفسیری ئاسان

ئەوەش لە حیکمەتە گەورەکانە، باشە ئەگەر هەموو ئیش کارەکانمان بە بەردەوامییەکی جێگیر و پڕ ئارام بڕوات بە ڕێوە و ڕەوڕەوەی ژیانمان هەر بە هێمنی یەکی نەگۆڕ بڕوا ، لێرەدا مرۆڤ چی بەسەر دێت...؟

بێگومان تووشی فیز و لووت بەرزی دەبیت...ئەی وا نی یە؟!

ژیانی ئارام و جێگیر هیچ خەڵتە و خەوشێك نییە پیسی بکا...بەردەوامی لە ناز نیعمەت و ئاسوودەیی و قازانج هەر لە کەسانی درۆزن و مایە پووچ ڕوودەدات.

جا لێرەدا مرۆڤ تووشی فیز و لووت بەرزی و تووشی خۆ بەگەورە زانین دەبێت کە وا دەزانێ پێویستی بە خوا نییە ئیدی فیز بەسەر خوا دەکات...هەر بۆیە خودا تاقیمان دەکاتەوە...ئێمەش بۆی دەگەڕێینەوە و ملکەچی دەبین و پێویستمان پێی دەبێت... جا ئەوەش ڕەحمەتێکە بۆ ئێمەی ئادەمیزاد.

ئای چ واتایەکن... کە دڵە زیندووەکان هەستی پێ دەکات و چێژی لێ وەردەگرێت...!!

**حیکمەتی چوارەم: هەتا تامەزرۆی بەهەشت بیت...!**

حیکمەتێکی تر ئەوەیە...کە تۆ تا تاڵی و سوێری دونیا نەچێژی قەت تامەزرۆی شیرینی بەهەشت نابیت !! ئاخر چۆن

تامـەزرۆی بەهەشـت دەبیـت گـەر لـە دونیـا تێـر حەسـانەوە و تێـر حەوانەوە بیت...

ئەوە مانای ئەوە نی یە ڕقت لە دونیا بێت...

(نەخێر بەڵکو ماندوو بە ، هەوڵ و تەقەلاّ بدە ، دروست بکە ، ئاوەدان بکەوە و...و...)

وە خواش تاڵی و ترشی دونیات پێ دەچێژێ بۆ ئەوەی ئاواتە خوازی شیرینی بەهەشت بیت.

**پێنجەم: هەتاوەکو خوا لە بیر نەکەی**

وە هەروەها لە حیکمەتەکانی تاقیکردنـەوەی خـوا ئەوەیـە... کـە بـەلاّ و تـاقی کردنــەوەکان خـوای خـاوەن نـاز و نیعمـەتت بـە بیردێنێتەوە... ئینجا بەلاّکە دەبێتە هۆیـەك بـۆ سوپاسـگوزاری خـودا لەسەر ئەو نیعمەت و خۆشی یەی کە پێ ی بەخشیوی وە بـە قـەزا و قەدەری ئەو ڕازی دەبیت چونکە دەزانی خودا زانایە دانایە ڕەحمانـە هەرگیز کاری نابەجێ ناکات.

ئیتر قەت لە بیری ناکەیت...

**حیکمەتی شەشەم: بۆ ئەوەی بزانی کە خوا بەهێزە:**

وە لـە حیکمـەتی تاقیکردنەوەکانـدا... دەرخـستنی هێـز و دەسەلاّتی زاتی خوایە (عزوجل) ، جا هەر کاتێك لەم تاقیکردنەوانـە دەربازی کردی، سیفەتی هێزو دەسەلاّتی و سیفەتی میهرەبـانی و بـە

بەزەیی ئەو زاتەت بۆ ڕوون و ئاشكرا دەبێتەوە...خوا تاقیت دەكاتەوە تۆش پەنای بۆ دەبەی ئەویش دەستت دەگرێ ، ئەوجا دەزانی كە خوا بە توانا و بە دەسەلاتە... ئەو خوایە بە هێزە... بە بەزەیی یە.

## حیكمەتی حەوتەم: چونكە خودا خۆشی دەوێت

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: (( إنّ اللهَ عَزّ وَجَلّ إذا احبّ قوماً ابتلاهم))[1]،

واتە:( خوای عز و جل گەر قەوم و هۆزێكی خۆشویست تاقیيان دەكاتەوە) خودای میهرەبان تاقیت دەكاتەوە... ئەی بەندەی ئیمانداری... پاكی... بێ خەوشی... پارێزكار...

# چەند نموونەیەك لە نارامگران

## نارامگرتنی ئەیوب( علیه السلام)

پێغەمبەر ئەیوب (علیه السلام)، ٨٠ ساڵ ژیا... وە لەو ماوەیەی تەمەنیدا ، خوا (١٤) كوڕ و كچی پێ بەخشی... تەندروستییەكی زۆرباشی هەبوو... هەموو خەڵك خۆشیان دەویست... پاشان و پاش ئەو هەموو ناز و نیعمەت و خۆشییە خوا هەموو كچ و كوڕەكانی لێ دەسێنێتەوە... ئینجا تووشی نەخۆشییەكی

[1] رواه إمام أحمد في (الحديث: ٢٤٣٤١)، رواه إبن ماجة في (الحديث: ٤٠٣١)، رواه ترمذي في (الحديث:٢٥٧٦)

زۆر سەخت دەبێت هەتا وای لێ دێ دانیشێ و توانای جوولەی نەمێنێ ، ئینجا وورده وورده ئەندامەكانی لەشی دەستیان بە هەڵومرین كرد، ئەوسا خەڵكانیش لێ ی ترسان و لە دەستی رایانكرد... ئەی خوایە!! ئەوە چ تاقی كردنەوەیەكە... هێز و دەسەلأت هەر بۆ تۆیە خودایە، ئیتر كەس لەگەڵی نەمایەوە تەنها خێزانە وەفادارە ئارامگرەكەی نەبێ ، ئەو بارو وەزعەی گەورەمان ئەیوب ١٨ ساڵ بەردەوام بوو ، هەتا وای لێ هات خێزانەكەی هەموو پارە و سامانەكەی خەرج كرد ئیتر لە ماڵی پێغەمبەر ئەیوب هیچ نەما سەرف بكرێ و بخورێ. هەر بە درێژەدانی ئەم بارو دۆخەوە خێزانەكەی ناچاربوو لە ماڵی خەڵك ئیش بكات... سەیری ئەو كۆمەڵە تاقی كردنەوانە بكە... خێزانی پێغەمبەرﷺ لە لای خەڵك ئیش دەكات بۆ ئەوەی پاروو نانێك بۆ پیاوە دانیشتووەكەی پەیدا بكات ... ئەم بارو وەزعە وەها درێژەی دا تا ئافرەتەكە ووتی: دە تۆ داوا لە خودا ناكەیت تا چاكت كاتەوە ؟ گەورەمان ئەیووبیش وەڵامی دایەوە و ووتی: خودا ٨٠ ساڵ ناز و نیعمەتی پێ بەخشیم جا دەبێ ٨٠ ساڵیش خۆم بگرم و ئارامبگرم و ئەوكات داوا لە خودا دەكەم !! ئینجا گەورەمان ئەیووب هەر ئارامیگرت تا خێزانەكەی ناچار بوو كە قژی خۆی بفرۆشێ بۆ پارووە نانێك ئەوجا داوا و نزای لە خودا كرد...

ئەو نەیووت: ئەی پەروەردگار ١٨ ساڵ ئارامگرت؟ هەرگیز نەیووت ؛ لەبەر چی خودایە ئەو هەموو بەڵایە؟ نەخێر ئەو گوتی:

﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾[1].

واتە: (بە ڕاستی من ئازار و ناخۆشیم تووش بووە، تۆش خوایە لە هەموو کەس میهرەبانتر و لە هەموو کەس دڵۆڤانتری) [2].

وەڵامدانەوەی خوای گەورەش ئەمە بوو:

﴿فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِنْ ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ﴾[3].

واتە: (هەموو نەخۆشی و ناخۆشی یەكمان لە كۆڵ كردەوە، هەموو ماڵ و منداڵیمان پێبەخشیەوە و ئەوەندەی تریش لەگەڵیاندا (دەكرێت خوای گەورە هەر هەمان ماڵ و منداڵی پێشووی بۆ زیندوو كردبێتەوە، یاخود ئەوەی نوێی پێبەخشیبێت)، ئەوە ڕەحمەتێكی تایبەتی بوو لە لایەن ئێمەوە).

دەگێڕنەوە دەڵێن: ئەو كە لە نەخۆشی چاك بۆوە ، ٢٨ كوڕ و كچی پێ بەخشرا (ئەوەندەی تریش لەگەڵیاندا: واتە بە زیادەوە ) ، خوای گەورە بەرەكەت و زیادەی خستە ماڵ و سامانی وە لە نەخۆشیش هەڵسایەوە و چاك بۆوە و تەندروستی وەك خۆی گەڕایەوە.

---

[1] سورە الانبیاء ٨٣

[2] تەفسیری ئاسان

[3] سورە الانبیاء ٨٤

پـاکی و بێگـەردی بـۆ خـوا !! نموونەیـەکی سـەیرە لـە ئارامگرتنـا... لەبـەر ئەوەشـە پـاش هـەزارەها سـاڵ وەك پەنـد و گوتەیـەکی کۆن دەگوترێتـەوە و دەڵێن: دە تـۆش سـەبری ئـەیووبت هەبێ...

خوای گەورەش دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِراً نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴾[1].

واتـە: (ئێمـە بینیمـان بـە ڕاسـتی خـۆگر و ئـارامگر بـوو، بەندەیـەکی چـاك و ڕێـك و پێـك بـوو، بێگومـان ئـەوە تەوبـەکارە هەمیشە دڵی لای پەروەردگارە)[2].

دە تۆ لە کوێی دەرد و بەڵاکانی ئەیووب لە کوێ !!

( تـۆش ئـەی خوشـکی موسـوڵمانم لـە خێزانـی گـەورەمان ئەیوب فێر بە، چینێك لە ئافرەتان هەن کاتێك بارودۆخی پیاوەکەی دەگۆڕێ بۆ بارودۆخێکی تری نالەبار ئەوا دەسبەجێ پیاوەکە بە جێ دێڵێ و ئارامناگرێ )

تۆ لە کوێی پێغەمبەر یوسف لەکوێ...!؟

نموونەیـەکی تـر لـە ئـارامگران ، گـەورەمان یوسـف (علیـە السلام) کـە دووچاری چـەندین تاقیکردنـەوە بـۆوە... ڕق و قینـە و

---

[1] سورة ص: ٤٤

[2] تەفسیری ئاسان

خۆشنەویستنی براکانی بۆی ، مانەوەی ناو بیری قووڵ و تاریك ، فرۆشتنی و بە کۆیلە بوونی پاش ئەوەی شکۆداری کوڕی شکۆداری کوڕی شکۆدار بوو، لە کیس چوون و دوورکەوتنەوەی لە کەس و کار و نیشتمانەکەی و ٢٠ساڵ غەریبی و دووره وولاتی، گێچەڵپێکردنی لەلایەن خێزانی عەزیزی میسر)، ئەشکەنجەی ٩ ساڵی ناو زیندان، وە لە کۆتاییا تاقیکردنەوەی بە پارە و دەسەلآت و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی.

ئەگەر یەك لەم بەڵایانە بەسەر هەر مرۆڤێکدا هات ، ئەوا بەسێتی بۆ ڕووخان و تێکشکانی ئەو کەسە ، بە تایبەتی ئازار و ئەشکەنجەی بیرەکە کە چۆن قورئان وەسفی کردووە (غَيَابَتِ الْجُبِّ - تاریکایی بیرەکە) پاشان گێچەڵ پێکردنی خێزانی عەزیزی میسر کاتێك هەوڵی دا سەرنجی یوسف بۆ خۆی ڕابکێشێ و لەخشتەی ببات کە بە پلانی خۆی هەموو دەرگاکانی لەسەر داخست و پەلاماری یوسفی دا... و.. وە لە بەرامبەر ئەو هەموو تاقیکردنەوانەش گەورەمان یوسف ئارامیگرت و خواش ڕزگاری کرد.

ئایا تۆ چەند گێچەڵ پێکردن وە چەند بەلا و ئەشکەنجەت بەسەرا هاتووە و ئارامت گرتووە وەك ئارامگرتنی پێغەمبەر یوسف...

خوا چی پێ خۆش بێت ئەوەم پێخۆشە...!! گەر پرسیار بکەم لە بارەی ئارامگرتنی تۆ لە بەرامبەر ئارامگرتنی یوسف...

بێگومـان تـۆش وەڵامدەدەیتـەوە دەڵێـی: مـن مرۆڤێکـی ئاسـاییمە و یوسفیش پێغەمبەرە ) !! باشە!

(عمران کوڕی حصین) یەکێك بـوو لـە هاوەڵانی پێغەمبـەر ( صلى الله عليه وسلم ) کە تووشی نەخۆشی یەکی سەخت بوو تـا لـە جووڵەدا کەوت( لەناو جێگا کەوت )... ئیـدی سـاڵانێکی دوور و درێـژ هەر ئـاوا مایـەوە... خـەڵکیش بەسـەریا دەهـاتن و سـەردانیان دەکـرد ئـەویش بـێ جووڵـە کـەوتبوو...ئـەوەی دەهاتـە سـەردانی بـۆ حـاڵی دەگریـا، ئـەویش سـەیریانی دەکـرد ئـەو کـات قسەیەکی زۆر خۆشـی کرد وتی: (خوای چی پـێ خـۆش بێـت ئـەوەم پـێ خۆشـە). هـا...ڕات چـیـیە لـەو نموونەیـە؟... گـوێم لێتـە دەڵێـی: ئـەوە هـاوەڵێکی پێغەمبەرە و منیش مرۆڤێکی ئاساییم...!!

**لەززەتی پاداشت تاڵی ژانی لە بیر بردمەوە...!!**

چـیرۆکەکەی پێغەمبــەر یوســفت خوێنــدەوە و قــەبارەی تاقیکردنەوەکانت بینی و گوتت: ئەوە پێغەمبەرە !!

سـەبارەت بـە (عمـران کـوڕی حـصین) گوتـت: ئـەو هـاوەڵێکی پێغەمبەرە ﷺ ببوورە...دە باشە ئەم نموونەیە نەبێ چیتر بە کەڵکت نایەت...

ئافرەتێك دەستی بڕاوە...!!

(بیر لەو ژانە و ئازارە توندە بکەوە)

که دەستی بڕایەوە پێکەنی!! پێیان گوت: هەست بە ژان و ئازار ناکەیت؟ ئەویش گوتی: لەززەتی پاداشتەکەی تاڵی ژانەکەی لە بیر بردمەوە.

ئاخر ئەوە ئافرەتە !!!

ئەوە چ ئارامگرتنێکە... !؟

وە لە نموونەی ئارامگران: دایکی سولەیم و پیاوەکەی (خوا لێیان ڕازی بێ) خودا کوڕێکیانی پێ بەخشی، ئەو کوڕەش تووشی نەخۆشییەکی توند بوو بوو، کوڕە خۆشەویستی یەکی گەورەی لە دڵی دایك و باوکیدا دروست کردبوو، شەوێك کوڕە دەمرێ، دایکە ئیماندارە ئارامگرەکە نەیویست بەم شەوە پیاوەکەی بزانێت و غەمباری بکات ، ئازار و غەمەکەی تەنها بۆ خۆی هێشتەوە، کە پیاوەکەی هاتەوە گوتی: تەندروستی کوڕەکەمان چۆنە؟ ئەویش لە وەڵامدا ووتی: کش و مات بووە (باوکەی وا تێگەیاند کە نووستووە بە مانای حەساوەتەوە)، پیاوەکە گوتی: سوپاس و ستایش بۆ خوا ئەوجا ئافرەتەکە هەڵسا بە جوانترین شێوە خۆی بۆ پیاوەکەی ڕازاندەوە وە ئەو شەوەی بە خۆشی لەگەڵدا بردە سەر... کە بەیانی هات ژنە گوتی: ئەگەر دراوسێکەمان ئەسپاردەیەکی لای ئێمە دانابوو بۆیان بگەڕێنینەوە؟

گوتی: بەڵێ، ژنەش گوتی: ئەی ئەگەر ڕۆژگار درێـژە بـۆوە و تێپەڕی و ئەسپاردەش هەر لە لامان مابوو ، پیاوەکەش گوتی: ئـەوە حەقترە بگەڕێنرێتـەوە، ژنـە گـوتی: ئـەم حیـسابە بـۆ کوڕەکەت بکە چونکە خودا ئەسپاردەکەی وەرگرتەوە.

ئەوە چ ئارامگرتنێکە، ئایا دەتوانی ئاوا ئارامبگری...؟

خوشـکەکەم هـەوڵ بـدە... براکـەم ئـاوا هـەوڵ بـدە... خـواش لەگەڵتانایە.

# مەرجەکانی ئارامگرتن لەسەر دەرد و بەڵاکان

## مەرجی یەکـەم: ئارامـگرتن لەگـەڵ یەکـەم پێکـدادانا

مـــەرجی یەکـــەم لـــە ئـــارامگرتن لـــە بـــەڵا و تـــەنگ و چەڵەمەکان...ئەوەیە کە لەگەڵ یەکەم هەواڵی زانینـی کارەساتەکە دەسبەجێ یەکسەر ئارامبگری...

لەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ لە گۆڕستان بوو ئافرەتێکی بینی لـە لای گۆڕێکەوە دەگریا و شیوەنی دەکرد... پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ئەی بەنـدەی خـوا لـە خـوا بترسـە ونـارامبگرە) ئـەویش گـوتی: لێم گەڕێ خۆ تۆ وەك من تووشی ئەو تەنگ و چـەڵەمەیە نەبوویتـە، تـۆ نازانی، هاوەڵان یەکسەر پێیان گوت: ئـافرەت ئـەوە پێغەمبـەرە(ﷺ)،( ئەو ئافرەتە پێغەمبەری نەناسی چونکە قـەت لـە بـەر دەرگای مـاڵی

پێغەمبەرﷺ دوو پاسەوان و دەرگاوانی نەبینی بوو) بۆیە گوتی: نەمناسیت ونەمزانی! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (ئارامگرتن لەگەڵ یەکەم پێکدادانە وە لەگەڵ یەکەم ساتی زانینی هەواڵی موسیبەتەکەیە)[1].

گەر ویستت پاداشتی تەواو وکامڵ وەرگری لەگەڵ یەکەم هەواڵ پێگەیشتن و لەگەڵ یەکەم پێکادان خۆت بگرە و ئارامبگرە

وە هەروەها ئەم ئایەتەش لە بیرمەکە:

﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾[2].

واتە: (بە ڕاستی تەنها خۆگران پاداشتیان بێ سنوور و بێ ئەندازەیە)

**مەرجی دووەم: ئەم نزایە فێربن و بیپارێزن...!!**

مەرجی دووەم لە مەرجەکانی ئارامگرتن لەسەر دەردو بەڵاکان ئەوەیە کە ئەگەر بەڵا و نەهامەتییەکت بۆ هات بڵێ:

﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾[3].

---

[1] رواه البخاري في (الحديث: ١٢٥٢)، مختصراً و(الحديث:١٢٨٣)و (الحديث:١٣٠٢)، ومسلم في (الحديث:٢١٣٦)، و أبو داود في (الحديث:٣١٢٦)، والترمذي في (الحديث: ٩٨٨) مختصراً، والنسائي في (الحديث:١٨٦٨).

[2] سورة الزمر، ١٠

[3] سورة البقرة، ١٥٦

واتە: (ئێمە موڵکی خوداین و هەرچی هەمانە بەخششی ئەوە و سەرئەنجامیش هەر تەنها بۆ لای ئەو زاتەیە گەڕانەوەمان).
وەهەروەها بڵێ:
(خوایە پاداشتم لەسەر ئەو بەڵا و موسیبەتە بدەوە وە بۆم قەرەبوو بکەوە بە باشتر) [1]

ئەم دوعایە فێربە و بیپارێزە... نەك هەر لە کاتی مردنی کەسێکت بەڵکو ئەو نزایە بۆ هەر بەڵا و موسیبەتێك بێت دەگوترێت...

باشیش بزانە کە خوای گەورە پاش ئەوە باشتر و چاکتری بۆ دانای... ئەگەریش بڕوا ناکەی...!؟ ئەم سەرگوزشتەی خوارەوە بخوێنەرەوە :

## نزایەکی قبووڵ کراوی سەیر

ئایا دەزانی مێردی (دایکی سەلەمە) کێ یە..!؟

گەورەمان باوکی سەلەمەیە کە لە شەهیدانی بەدرە ( لە هێرشی بەدر بەشداری کرد و شەهید بوو)... ئێمە دەزانین ئەوانەی کە لە غەزای بەدردا بەشداریان کرد شکۆدار و مەزن و بە پلە و پایە بوون، وە خوای گەورەش لێیان خۆشبوو... هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ

[1] رواه مسلم في (الحديث، ٢١٢٤)، والترمذي في (الحديث، ٢٥١١)، وابن ماجه في (الحديث، ١٥٩٨)، والإمام احمد في (الحديث، ٣٧\٤) .

کە دەفەرموێ (لەوانەیە خوا بەسەر کەسانی بەدرا دەرکەوتبێت، فەرمووبێتی (عزوجل): ((چی دەکەن بکەن من لێتان خۆشبووم))

...ئیتر کە ئەبو سەلەمە شەهید کرا دەسبەجێ دایکی سەلەمە وتی:

﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ پاشان بێ وەستان نزاکەی کرد وتی (خوایە گیان پاداشتم بدەوە لەسەر ئەو بەڵایە وە بۆم قەرەبوو بکەوە بە باشتر لەوە)...، ئەوجا دانیشت و بیرێکی کردەوە گوتی: ئاخر چاکتر و باشتر لە باوکی سەلەمە کێ یە؟... کەس... خۆ ئەو هاوەڵێك بوو وە لە شەڕی بەدر بەشداری کرد و شەهید بوو؟

لە دواییا پێغەمبەرﷺ مارەی کرد کە ئەو چاکتر و باشترە لە باوکی سەلەمە.

بەڵام لێرەدا وەڵامدانەوەی ئەم نزایە بەدوو مەرج دێتە دی:

١- ئارامگرتن لە یەکەم ساتی بەڵا و تەنگانە.

٢- بڕوای تەواو و دڵنیایی لە وەڵامدانەوەی نزاکە.

## مەرجی سێ یەم: ئارامگرتنێکی جوان و چاك

مەرجی سێیەم لە ئارامگرتن لەسەر تەنگ وچەڵەمە ولەسەر بەڵاکان..دەبێ ئارامگرتنێکی بە بێ بێزاری و بێ سکاڵا کردن بێت... ئێ خۆ خوایە تۆی تاقیکردۆتەوە... ئاخر چۆن سکاڵای خوا لای مرۆڤ دەکەیت ؟ دیارە بە قەزا و قەدەری خوا ڕازی نیت...؟!

بەڵام دەشێ بە نیازی هەواڵ گەیاندن بۆ کەسێك بیدرکێنێ... بۆ نموونە کە کەسێك نەخۆش کەوت، پزیشك تێدەگەیەنیت... یاخود ئەوەی تووشی بەڵایەکی گەورە بووە...ئەوا بە نیازی ڕاوێژ و ڕاوەرگرتن بۆ هاورێکەی دەگێڕێتەوە...ئیتر ئەوە دەمێنێتەوە سەرخۆی و نیازی خۆی.

نەکەی سکاڵای خوا لای خەڵك بکەی... نەکەی بێزاری و ناڕەزایی بە قەزا و قەدەری ئەو دەربڕی.

بەڵکو ئارامگرتنێکی چاك و جوان بگرە... ڕازیش بە.

# جێ بە جێ کردنی ئارامگرتن

## کیروگرفتێک کە لەم ڕۆژگارەدا دەرکەوتووە...کە ئەوەش چارەسەریەتی

خۆشی و بەختەوەری هاوسەرێتی تەواو لە زۆرێك لە ماڵەکانا وون بووە و نەماوە... لەبەرئەوە ئەم فەرموودەیەمان هەڵبژاردووە کە تایبەتە بە پیاوان...! پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

((هیچ کەسێ( پیاوێ) با ڕووگرژ نەبێت و ڕقی لە بەرامبەرەکەی (خێزانەکەی) نەبێتەوە کە ئەگەر خووێکی خراپی هەبێت کە پێی ناڕازییە ئەوا چەند خووێکی باشتری هەیە کە پێی ڕازییە)) [1]

---

[1] رواه مسلم في (الحديث، ٣٦٣٣)، والإمام احمد في (الحديث، ٢\٣٢٩) .

بەڕاستی ئەوە واتایەکی جوان دەبەخشێت... واتە هەر هەموو ئەو ڕەوشتانەی لە خێزانەکەیدایە خراپ نین.

هەندێك ڕەوشتی خراپن هەندێکی تریشی سیفاتی جوانن... نەکەی ڕق و قینەت لێی هەڵسێ بە هۆی هەندێك لەو ڕەوشتانەی کە تۆ پێی ڕازی نیت و پێت خراپە... ئەوەی ڕاستی بێت... ئەوە کێشەیەکی بڵاوە لە کۆمەڵگای ئێستادا... هەندێ لە پیاوان هەن دەڵێن: دەمەوێ خێزانەکەم بەجێ بێڵم و وازی لێ بینم وە یەکێکی تر مارە بکەم... یان دەڵێ: ناتوانم ژیان لەگەڵ خێزانم بەرمەسەر... کاتێك لێی دەپرسی: ئاخر ئەو چی کردووە؟ دەڵێ: هیچ، بەڵام من نامەوێ... بە ڕاستی لە خێزانەکەمدا زۆر شت دەبینم کە مایەی دڵتەنگی منە...لەبەر ئەوە دەمەوێ ژنێکی تر مارە بکەم...!! گەنجانێك کە هێشتا ژنیان نەهێناوە هەست بەو کێشەیە ناکەن... بەڵام بە ڕاستی کێشەیەکی باوە و بڵاوە...

منیش بەم پیاوانە و نموونەی وەك ئەوان دەڵێم: خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾ [1].

واتە (ئەوا دوور نی یە و دەشێت حەزتان لە شتێك نەبێت و خوا بیکات بە مایەی خێر و بێری زۆر و بێ سنوور).

---

[1] سورة النساء، ١٩

ڕێنماییەك بۆ پیاوەكان... ئارامبگرن لەسەر خێزانـەكانتان... سەیری سیفەتە جوانەكانی بكە كە تۆ بە دڵتە وە گەشە بەو سیفەتە جوانەی بدە و یارمەتیشی بدە بۆ چاككردنی ئەو ڕەوشـتانەی كە تـۆ بە دڵت نین و لەودا هەیە... ئەوەش بزانە كە ئێمە مرۆڤین فریـشتە نین.

**لـە بـەڵا و موسـیبەت ئارامـدەگری لـە نـاز و نیعمەتـەكان ئارامناگری...!!**

خـەڵكانێكی زۆر هـەن كـە دەیـانبینین لـە كـاتی تەنگانــەدا ئارامگر و لەسـەرخۆن، كەچی كاتێـك خـودا دەرگـای نـاز و نیعمـەتی دونیـایان لێ دەكاتەوە خۆیان پـێ نـاگیرێ و ئارامنـاگرن... یـەكێك لـە هـاوەڵانی پێغەمبــەر ﷺ دەڵـێ: (لەگـەڵ پێغەمبـەراﷺ بـە ناخۆشـی یەكان تاقی كراینەوە ئاراممان گرت پاشان بە ناز و نیعمەت و خۆشی یەكان تاقی كراینەوە ئارامان نەگرت.)

پاكی و بێ گەردی بۆ خوا !! هەندێك لە گەنجانمان لـە ژیـانی نــاخۆش ونالــەباری ئارامــدەگرێ بــەڵام كــە دەرگــای دونیــای بــۆ دەكرێتەوە، موبایل هەڵدەگرێ و سەرپێچی خوا دەكا...

خۆ ئەگەر ئۆتۆمبیلێكیشی كـڕی ئـەوا زیـاتر یـاخی دەبێـت و زیاتر تاوان دەكا... توخوا گەنجەكان ئەوە ڕوونادات...!؟ توخوا لـەو كاتەی كە لە تەنگانـەدا بووی وە بە جۆرێكی وا كە ژیانت گەیشتبووە

ئەوپەڕی ناڵەباری ئەوجا سەرکەشی خودات نەدەکرد و لاسار نەبوویت... ئاخر بۆ ئارامناگری لە خۆشی یەکان؟...ئایا ناتوانی لە خۆشی یەکانی دونیا سەرپێچی خودا نەکەیت و ئارامبگریت...؟ ئاخر تاقی کردنەوەی گەورەمان یوسف کە بوو بە شالیاری (وەزیری) پارە و سامانی میسر زۆر گەورەتر وقورستر بوو لە تاقی کردنەوەی زیندانی کردنی لە بەندیخانە.

ئاگادار بە... تاقیکردنەوە خۆشەکان بە پێچاوپێچی دێت...وە تۆ هەستی پێ ناکەیت...بەڵام تاقیکردنەوە ناخۆشەکان زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی دێت...تێگەیشتی!؟

جا لێرەوە جۆری یەکەمی ئارامگرتن کۆتایی پێهات.

## جۆری دووەم: ئارامگرتن لەسەر گوناھ و سەرپێچی یەکان

### دە تۆ یوسفی ئەم ڕۆژگارە بە

ئەم جۆرە کە باسی لێوە دەکەین تایبەتە بە گەنجان... جا گەنجەکان تکا دەکەم کە ئەم قسانەم لێ وەرگرن...

لە ترسناکترین ئەو گیروگرفتانەی کە گەنجانی ئەمڕۆمان دووچاری دەبنەوە...پەیوەندی کردنی پیاو و ئافرەتە لەگەڵ یەکتری)...!!

جا بۆ ئەم مەبەستە ، نموونەیەکتان بۆ دێنمەوە سەبارەت بە ئـارامگرتن لـە سەرپێـچی و گونـاهکردن کـە ئـەویش بەسـەرهاتی گـەورەمان یوسـفە لەگـەڵ خێزانــی عزیـزی میـسردا کـە دووچـاری هەمان گیروگرفت بۆوە...

یوسـف گـەنجێك بـوو خـاوەن تەندروسـتییەکی بـاش... جـوان...(نیـوەی جـوانی جیهـانی پێبەشـخرابوو)...کۆیلـە بـوو ، کۆیلەش لە مرۆڤـی ئـازاد بوێرتر و چاونەترسـترە... چونکە کۆیلـە وەك مرۆڤی ئازاد لێیناپێـچرێتەوە وە وەك ئـەویش سزا نادرێت ،... هەروەها کەس نەیدەناسی و غەریب بوو چونکە دووربوو لە کـەس و کار و وولاتی خۆی... ئەوانەی کە لە سەرەوە باسکران هـەر هـەمووی بواری ڕەخساو بـوو بـۆ ئەنجامـدانی سەرکەشـی و سەرپێـچیکردن بـە ئاسانی.

کەواتـە گـەورەمان یوسـف گەنجـە، زۆر زۆر جوانـە، کۆیلەیـە، غەریبە و کەس نایناسێ.

بـــا بـــچینە بەرامبەرەکـــەی...خێزانـــی عـــەزیزی میـسر...ئـافرەتێکی شـۆخ و شـەنگە... دەسـەڵاتدار و بـە پلـە و پایەیە...جا خانم داوای یوسف دەکات و بە توندی دەرگاکانی لەسەر دادەخـات (کەسـیش نایـانبینێ)، ئینجـا خـانم داوای کـاری ناشـەرعی لێدەکات و شوێنی دەکەوێت، بەڵکو لەوەش زیاتر هەڕەشە و گوڕشـەی

لێدەکات کە ئەگەر هاتوو یوسف داواکاری یەکەی جێ بە جێ نـەکرد ئەوا دەیخاتە زیندانەوە.

ئایا ئەوە بەسەر هیچ کەسێکتانا هاتووە...ئـاخر قورسـتر و سەختر لەم تاقی کردنەوەیە چی یە...!؟

بـــەڵکو لـــەوەش زیـــاتر خـــانم هـــەموو ئافرەتـــانی وولات کۆدەکاتەوە، هەر هەموویان دێنە دەوری یوسف کە هەریەك بۆ خـۆی دەیەوێت هەڵیخەلەتێنێ و سەرنجی ڕابکێشێ.

دەترسـم بـەم قسانە سـەرنجی دڵت ڕابکێـشم و... بـەڵام لـە بیرت بێ (کارو کردەوەکان بە پێ ی نیازە)

خۆ ئەوە خەونەکانی یوسف نەبوون...!!

جا لێرەدا وەڵامی گەورەمان یوسف بۆ خانم ئەمە بوو:

﴿ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ﴾[1].

واتـــە: (پـــەنا دەگـــرم بـــە خـــوا کـــاری وا ناکـــەم، چـــونکە پەروەردگارم دەرووی لێ کردوومەتەوە، هەروەها مێردەکەشت چاك رەفتار بووە لەگەڵما (چۆن خیانەتی لێ دەکەم) [2].

ئایا تۆ دەتوانێ ئاوا بیت؟... دەی ئێستا دەست پـێ بکـە... نـە پەیوەندی تەلەفۆنی... نە یەکتر بینین... نە خەندەیەك... و نە...

---

[1] سورة یوسف:٢٣

[2] سورەتی یوسف:٢٣(تەفسیری ئاسان)

سوێند بە خوا سەرگوزشتەی گەورەمان یوسف هیچ بەهانە و عوزرێکی بۆ هیچ لە گەنجان نەهێشتۆتەوە...

گوێم لێتە دەڵێی: ئاخر تۆ زانکۆت نەبینیوە ، منیش پێت دەڵێم: خۆ تۆش کۆشك و تەلاری عەزیزت نەبینیوە...!! پاشان دەڵێی: ئەی کەناڵە ئاسامانیەکانت خۆ تۆ نەتبینیوە بە تایبەتی کەناڵە خراپ و بەرەڵاکان.

منیش پێت دەڵێم: تۆش ئافرەتێکی شۆخ و شەنگت نەبینیوە بە توندی دەرگاکانت لەسەرت دابخا وە هەموو بارودۆخێکت بۆ تەرخان بکا و بۆت بڕەخسێنێ ئەوجا تاوت دا و پڕت بداتێ، پاشانیش هەڕەشەی زیندانی کردنت لێبکات گەر بەر ئەمری نەبیت و ئەم کارەی لەگەڵ ئەنجام نەدەیت !!

بە داخەوە هۆکارەکانت لاواز و نزمن بۆ ئەنجامدانی گوناه وکاری خراپ لە بەرامبەر ئەو هۆکارانەی کە زۆر بە ئاسانی بۆ یوسف ڕەخسابوو بۆ ئەنجامدانی گوناه وکاری خراپ ... هەر لە گفتوگۆی گێڕانەوەی چیروکەکە لە قورئاندا:

﴿ وَلَقَد رَاوَدتُّهُ عَنْ نَفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ ﴾[1].

---

[1] سورة یوسف:٣٢

واته: (خاتم دەڵێ : بێگومان من هەوڵم دا لە خشتەی بەرم، کەچی ئەو هەر خۆی گرت و پاك و خاوێنی ویست) [1]، ﴿فَاسْتَعْصَمَ﴾ واته: (خۆی گرت و پاك و خاوێنی ویست).

ئا ئەم ووشە عەرەبییە﴿فَاسْتَعْصَمَ﴾ بیکە بە ئەلقەی گوێت... بزانە تا چەند کاریگەری لەسەرت هەیە، ئایا هیچ ڕۆژێك وات بە نەفسی خۆت گوتووە؟! لەوەودوا کەر خۆت بە لاوازی بینی لەم جۆرە هەڵوێستانە ئەوا هەر لە ئێستاوە بیکە بە دروشمی خۆت... با ئەم دروشمە ﴿فَاسْتَعْصَمَ﴾ دڵت داخورپێنێ.

گەنجان... خۆتان پاك و خاوێن ڕاگرن... خۆتان بپارێزن... ئارامبگرن هەتا دەگەنە ژیانی هاوسەرێتی... بە خوا گەورەمان یوسف هیچ بەهانە و عوزرێکی بۆ نەهێشتوینەتەوە.

مەڵێ ڕۆژگارمان زۆر سەختە و خۆم پێ ناگیرێ.

ئایا بارودۆخی گەورەمان یوسف ئاسان و ساکار بوو...!!

ئاخ بۆ ئەو کەسەی کە ناتوانێ واز لە هاورێیەتی کچان بێنێ... وای لەو کەسەی کە ناتوانی واز لە پەیوەندییە تەلەفۆنەکان بێنێ... سەیری گەورەمان یوسف بکەن... ئای بۆ ئەوەی کە ئێستا بۆ ئارامگرتن لە سەرپێچی و گوناهکردن نیەت دێنێ و پەنا بۆ خوا

[1] سورەتی یوسف٣٢(تەفسیری ئاسان)

دەبات...با دڵنیا بێ كە خوا هەر سەرت دەخا وە لە ڕۆژی قیامەتا بە بەهەشتی شاد دەكا...

خوای گەورە دەفەرمێ:

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الْمَآبِ ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ ذَلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ [1].

واتە: (ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی زێڕ و زیووی زۆر و زەبەندە و ئەسپی چاك و ڕەسەن و (هۆكاری هاتووچۆ) هەروەها زەوی و زاری كشتوكاڵ و ماڵات بۆ خەڵكی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی ناز و نیعمەتی ژیانی دونیان، خوایش بۆ چاكان شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوە و خۆشی لای خۆی ئامادە كردووە (كە بەهەشتە) * (ئەی محمد ﷺ بەو خەڵكە بڵێ: ئایا هەواڵی چاكتر لەو ناز و نیعمەتانەتان پێ ڕابگەیەنم؟! (ئەویش ئەمەیە): بۆ ئەوانەی پارێزگار و خواناسن، لای پەروەردگاریان باخەكانی بەهەشت ئامادەیە بۆیان كە: چەندەها ڕووبار بە ژێر درەختەكانیدا بە بەردەم كۆشكەكانیدا دەڕوات).

---

[1] سورە ال عمران:١٤و١٥

## ئەوە چۆن ڕوویدا

سەر گوزشتەی گەورەمان یوسف گەورەترین ئارامگرتنە لەسەر نەکردنی گوناه وسەرپێچی کردن.

برای جگەرەکێشم، ئەم چیرۆکە ڕاستیە بۆ تۆ باشە ، دە بیخوێنەرەوە ، پیاوێکی جگەرەکێش ٤٠ ساڵ بوو جگەرەی دەکێشا، بەڵام پاش ئەوەی گوێبستی وانەکانی نزا وپاڕانەوە بوو بڕیاری دا کە بە تەواوی جگەرەکێشان لە خۆی قەدەغە بکات... ئیدی لە خوا پاڕایەوە و پەنای بۆ برد بۆ ئەوەی لە جگەرە دووری خاتەوە و ڕزگاری کات، جا لە دواییا بە ڕاستی خۆی لە جگەرە کێشان قەدەغە کرد و بە تەواوی وازی لێ هێنا... پاش ٤٠ ساڵ جگەرە کێشان... دەتوانێت و ئارامدەگرێ . ئارامگرتن و خۆگرتن لە تاوان و گوناه وات لێ ئەکات کاروکردەوەی دەرئاسا و موعجیزە ئەنجام بدەیت کە تۆ وای دەبینی موعجیزە و دەرئاسایە (هەندێك کەس هیچ خەیاڵ بۆ ئەوە نابات کە بتوانێت خۆی لە جگەرە کێشان قەدەغە بکا کەچی بە پێچەوانەوە توانای جێ بەجێ کردنی هەیە)...

ئەوەش بزانە کە یارمەتیدەرت لەسەر ئارامگرتن لە تاوان و گوناهەکان هاوڕێی چاك و دروستە و دوورکەوتنەوەتە لە هاوڕێی خراپ و ناپوخت ، هەروەها بڕوا و دڵنیاییەکی تەواوت بە خوا کە ئەو پشتیوانت دەبێ ئەگەر هاتوو ئارامبگری.

**زۆربەی زۆری گوناه و سەرپێچی کردنی ئافرەتانمان لێرە دەست پێ دەکات... !!**

زۆربەی زۆری گوناهی ئافرەتان لەو کاتە دەست پێ دەکات کە چاو دەبڕێتە سەر دونیای خەڵکی تری غەیری خۆی...

دەیەوێت وەکو فلان کچ دەرچێت...یا وەکو ئەو دەرچێت... هەرگیز وهەرگیز ئارامی نیە لە تێڕوانین و سەرنجدانی دونیای کەسانی تری غەیری خۆی.

پیاوەکەشی هەتا ئەو ژنە لە خۆی ڕازی کا پارەی بۆ دابین دەکا و شتی بۆدێنێتەوە و و...!!

﴿وَلا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾[1]

واتە: (ئەی ئیماندار تۆ چاوەکانت مەبڕە ئەو ناز و نیعمەتەی کە هەندێك خەڵکمان لێ بەهرەوەر کردووە، کە زینەت و ڕازاوەی ژیانی دنیایە، بۆ ئەوەی لەو نازو نیعمەتە تاقیانبکەینەوە)[2].

بەڵام هەندێك ئافرەتی ئیماندار هەن ڕازینە بەو بەشەی کە خوا پێیبەخشیون...منیش لەوانت حیساب دەکەم.

---

[1] سورة طه:١٣١

[2] سورەتی طه:١٣١ (تەفسیری ئاسان) .

## سەرگوزشتەی یوسف بەسیەتی بۆ تۆ...!؟

سەرگوزشـتەی یوسـف بـۆ تـۆ بەسـێتی وەکـو نموونەیـەکی ئارامگرتن لەسەر تاوان وسەرپێچی ، من وای بۆ دەچم کە گەیشتۆتە دڵی هەموو کوڕ و کچێك.

سـورەتی یوسـف بخوێنــەوە وسـەرنج بـدە ئایەتـەکانی بـە تایبەتی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ:

﴿قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ﴾[1].

واتە: (یوسف ووتی: ئەی پەروەردگار من زیندانم لە لا خۆشەویستره لەوەی کە ئەوان بانگم دەکەن بۆی) [2].

لەم سورەتە و لەم سەرگوزشتەی ڕابردوو هەست بـە هێزێك دەکەیت... هەست دەکەیت کە لێرە نەفس لە زینـدانی شـەیتان ئـازاد بـووە. هـەر لەبـەر ئەوەشـە هـەر کـاتێ خەفـەتبارێك یـان داماوێك یــاخود حەزکــەری ئــارەزووێکی(حــەرام) کــە ســورەتی یوســف دەخوێنێتەوە ئیلا غەمەکەی لەسەر نامێنێت و ئارەزووەکەی لەسـەر لاچێت و سەرف دەبێت.

## جۆری سێ یەم: ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵییەکان

چیرۆکێک کە تەنها جارێک ڕوویداوە و ڕووناداتەوە...!!

---

[1] سورە یوسف،۳۳ .

[2] سورتی یوسف،۳۳،(تەفسیری ئاسان).

ئەویش سەرگوزشتەی باوکی پێغەمبەرانە ئیبراهیم ﷺ و کوڕەکەیەتی ئیسماعیل (خ.ل)، کاتێك کە لە خەویا بینی سەری کوڕەکەی دەبڕێت، ئەوەش نموونەیەکی تاکە لە ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی خوا، کە دەگاتە ئەو ئاستەی باوك بێت بە فەرمانی خوا دەست بداتە چەقۆ و سەری کوڕەکەی ببڕێ.

(تۆش لە کاتی دیاری کراوی خۆی ناتوانیت نوێژ ئەنجام بدەیت)... (ناتوانی شەو نوێژ بکەیت) و...و باشە!...(ئیبراهیم فەرمانی خوا جێ بە جێ دەکا و کوڕەکی سەر دەبڕێ)... شەرمت بە خۆت نی یە (؟!)

سەیرتر لەوەدایە کە کوڕەش بە گوێی باوکی دەکات و دەڵێت:

﴿قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾[1].

واتە: (کوڕی چاك و خواناس و خۆگر ووتی: بابە گیان هەر فەرمانێکت پێدراوە جێ بە جێ ی بکە، دەمبینیت ئەگەر خوا حەز بکات، خوا بیەوێت، لە ئارامگران دەبم)، ئینجا پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ بە تەواوی دەستی بە سەر بڕینەکە کرد کە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ﴾[1].

---

[1] سورة الصافات:١٠٢

واتـە: (کاتێـك هـەردووکیان تەسـلیمی فـەرمانی پـەروەردگار بوون، ئیبراهیم ﷺ: ئیسماعیلی بەڕوودا خستە سەر خاك بۆ ئەوەی سەری ببڕێت)[۲].

سـەربڕینی کـوڕ لـە ئیـبراهیم ﷺ داوا نـەکرابوو بـەڵکو داواکراوەکـە جـێ بـە جـێ کردنـی فـەرمانی خـوا بـوو کـە تـاقی کردنەوەیەکی ئارامگرتن بوو لەسەر گوێڕایەڵی خوا.

بـەڕێزم... تـۆ لـە نوێـژە سـوننەتەکان تەمـەڵی و تـەوەزەلی داتدەگرێ...ئاخر گەورەمان ئیـبراهیم ﷺ بـە فـەرمانی خـوا چەقۆ دێـنێ و کوڕەکـەی سـەر دەبـڕێ...بـۆ بـە گـوێی خـودا ناکـەیت و فەرمانبەرداری ئەو نابیت و ئارامنـاگری؟ ئـێ بـۆ لەسـەر گوێڕایـەڵی خودا ئارامناگریت ئەی نوێژی وتر ناکەیت !؟...

## لێرەدا کوا ئارامگرتن لە کوێیە...!؟

پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێ: (حـەوت چـینە خـەڵك هـەن کـە خوا لە ژێر سـێبەری عەرشـی خـۆی دایانـدەنێ لـە ڕۆژێکـدا کـە هـیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری عەرشی خۆی نەبێ) [۳]

---

[۱] سورة الصافات:۱۰۳ .

۲ سورەتی ئەلصافات :۱۰۳(تەفسیری ئاسان)

[۳] رواه البخاري في (الحديث:٦٦٠) و (الحديث:١٤٢٣ و(الحديث:٦٤٧٩) و(الحديث:٦٨٠٦)، ومسلم في (الحديث:٢٣٧٧) ، والترمذي في (الحديث:٢٣٩١)، والإمام أحمد في (الحديث: ٢/ ٤٣٩).

لێــرەدا هــەر حــەوت چــین لــە ئــارامگرانن کــە ئەمانــەی خوارەوەن:

(پێشەوایەکی دادپەروەر) کە دەیتوانی زوڵم و ستەم بکات، بەڵام ئارامیگرت خۆی لە زوڵم و زۆرداری قەدەغە کرد وە لەسەر دادوەری ئارامی گرت ،

(وە گەنجێک کە هەرلە بنەڕەتا و هەر لە منالێیەوە لەسەر گوێڕایەڵی خودا پەروەردە بووە و گەورە بووە)، مانای هەر لە منالێیەوە ڕێ ی خوای گرتووە و ڕاستەڕێ بووە... لەسەر زیاد کردن و زیاتر ئەنجامدانی خواپەرستی ئارامگربووە...وە لە زیکر و دوعا و نزا و پاڕانەوە و گەڕانەوە و پەشیمانی و تەوبەکردن وە لەسەر خوێندنەوەی قورئان هەر بەردەوام و ئارامگربووە.

( ئەو کەسەی کە بە نهێنی خێرێك دەکات و وەها دەیشارێتەوە کە لێناگەڕێ دەستی چەپی بە دەستی ڕاستی بزانێت).ئەو جۆرە کەسەش بە دوای چاکە و بەخشینی شاراوە و بە نهێنی دەگەڕێ بۆ ئەوەی خێرەکەی لێ قبول بکرێ.

( دوو کەس بۆ خوا و لەبەر خاتری خوا یەکتریان خۆشویستووە) تەحەمولی یەکتریان کردووە و ئارامیان لەسەر ئەوە گرتووە.

(کەسێك لە خەڵوەت و تەنهایی یاد و یادەوەری خودای کردووە و فرمێسکی چاوەکانی بۆی لێشاوی کردووە). لێرەدا کوا

ئـارامگرتـن ؟ ئـيتر ئـەو لـە ڕۆژی پاشـتر نەهاتۆتـە دەرەوە و ئاشكرای كات و بڵێت: ئای كە سـاتێكی خـۆش بـوو خۆزيـا هـەمووتان وەك مـن فرمێـسكی چـاوەكانی لێـشاوی بكردايــە، نــا.. بــەڵكو ئــارامیگرتووە شاردوويەتیيەوە هەتا لە ڕۆژی دواييدا بۆی بنووسرێت.

( كەسـێك لــە ( پيــاو يــان ئــافرەت) دڵــی بــە مزگەوتــەكانا پەيوەند بێت)، ئەو كەسە لەسەر كارو فەرمانەكانی خوا ئـارامگرە وە بە چاكی ئەنجامی دەدات و جێبە جێی دەكات.

( كەسێك (پياوێك) كە ئافرەتێكی خاوەن پلە و پايـە و جـوان داوای كـاری ناشـەرعی لێكـردووە، ئـەويش گوتوويـەتی مـن لـە خـودا دەترسم)، واتە لە ترسی خوا ئـەم كـارەی ئـەنجام نـەداوە، ئـەو كەسـە سەرپێچی خوا ناكات وە لەسەر ئەوە ئارام دەگرێت.

كەواتــە هــەموو فــەرمان و گوێڕايەڵيــەكان پێويــستی بــە ئارامگرتنە... بەڵێ ئـارامبگرە خـوا خۆشـی دەوێـت و يارمەتيـدەر و پشتيوانت دەبێت.

## لەگەڵ ئيمانداراندا دەمێنمەوە

بــۆ ئــەوەی ئــارام بگــری لەســەر گوێڕايــەڵی يــەكان...دەبــێ ســووربی لەســـەر هاوڕێيــەتی كردنــی كەســانی چــاك وبــاش، وە دووربكەويتەوە لە هاوڕێی خراپ و ناپەسند.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾[1].

واتە: (ئارامبگرە و خۆت ڕاگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خواپەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەر زاریانە لە بەرە بەیان و دەمە ئێواراندا، مەبەستیانە و دەیانەوێت کە ئەو زاتە لە خۆیان ڕازی بکەن و، ڕوو لەوان وەرمەگێڕەوە و (ڕوومەکە دونیا پەرستان و دەوڵەمەندان) لە کاتێکدا تۆ زینەت و ڕازاوەیی ژیانت بوێت).

لەگەڵ ئیمانداراندا ئارامبگرن... لەگەڵ خواپەرستان ئارامبگرن و گوێڕایەڵیەکان جێ بە جێ بکەن.

## بەردەوام و کۆڵنەدەر و خۆڕاگربە لەسەری

وە هەروەها گەر دەتەوێ ئارامگر بیت لەسەر گوێڕایەڵی خوا...ئەوا پێویستە خێزانەکەت و منداڵەکانت فێری کۆڵنەدان و خۆڕاگری بکەیت وە هەمیشە لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خوا خۆت لەگەڵیاندا ماندوو بکەیت وە بە بەردەوامی فێری ئارامگرتنیان بکەیت، وە لە هەمان کاتدا تۆش دەبێ لەگەڵیانا هێمن و ئارامگر بیت جا چ لەگەڵ خێزانەکەت... چ لەگەڵ کوڕو کچەکەت... وە یان لەگەڵ دایك و باوکت...یاخود لەگەڵ خۆشك و براکەت.. بۆ نموونە لەسەر

---

[1] سورة الكهف،٢٨

چاك ئەنجامدانی نوێژ بە تایبەتی بۆ شەو نوێژەكان و شەو لە خەو هەڵساندا.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾[1].

واتە: (ئەی محمد ﷺ ئەی ئیماندار) فەرمان بدە بە هەر هەموو تاكەكانی خێزانت، تا نوێژەكەیان (بە چاكی ئەنجام بدەن، چونكە خۆراكی ڕوحە) و بەردەوام و كۆڵنەدەر و خۆڕاگر بە لەسەری).

ئێستا بیردەكەیەوە...و دەڵێی: لە كوێوە دەست پێكەم ئاخر چۆن دەست پێ بكەم؟... ووردە ووردە پەلە مەكە...ئەوەندە قورسی مەكە لەسەریان... بە نەرمترین و شیاوترین و ئاسكترین و جوانترین شێواز وە بە شێوەیەكی هونەرییانە بۆئەم مەبەستە مامەڵەیان لەگەڵدا بكە.

(خوایە گیان هیچ شتێك ئاسان نی یە گەر تۆ ئاسانی نەكەیت).

## وەسفێكی ناقی كراوی زامنكراوی ١٠٠٪...!!

گەورەمان عومەری كوڕی خەتاب هەموو شەوێ لە نیوەشەودا لە خەو هەڵدەستا و نوێژی دەكرد، وە كەمێك پێش فەجر (چارەگە

[1] سورة طه،١٣٢

سەعاتێك پێش نوێژی بەیانی) خێزانەکەی و مناڵەکانی هەڵدەساند ئەم ئایەتەی بۆ دەووتن:

﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾

واتە: (فەرمان بدە بە هەر هەموو تاکەکانی خێزانت تا نوێژەکەیان بە چاکی ئەنجام بدەن و بەردەوام و کۆڵنەدەر و خۆڕاگر بە لەسەری)

دەی با فێربین... بەردەوامی و کۆڵنەدان و خۆڕاگری... دەی هەوڵی جێ بەجێ کردنی بدەین !! لەگەڵ دایك و باوکتا خۆت بگونجێنە... لەگەڵ خێزان و مناڵەکانت ڕێککەوە لەسەر لە خەو هەڵسانی پێش بەرەبەیان بە چارەکە سەعاتێك بۆ ئەنجامدانی دوو ڕەکات نوێژی پێش نوێژی بەیانی... ئەوجا بۆ ڕۆژی پاشتر دەبینی کە چ خۆشییەك و چ بەختەوەری یەك ڕوو لە ماڵەکەتان دەکات...ئەوپەڕی حەسانەوە و هێمنی و ئارامی و خۆشەویستی و تەبایی...ئەی خوایە...!!

چەندین ماڵ نازانێ جەژن چی یە تەنها ساڵێ دوو ڕۆژ نەبێ...!!

چەند ماڵی تریش هەن زۆربەی ڕۆژانی ساڵەکەیان هەر جەژن و جەژنانەیە...!!

کەر یاریدەدەرێکت نەدۆزیەوە...!!

سەبارەت بە ئارامگرتنت لەسەر گوێڕایەڵی خوا کە ئەگەر کەسێکت نەدۆزییەوە یارمەتیت بدات و پشتیوانیت بکات... وە دەستت بگرێت... هەتا ئەگەر وانەی ئایینیت نەبێت و بۆت نەکرا تیایدا ئامادەبیت... ئەوا من ڕێنماییت دەکەم پێت دەڵێم ئارام بگرە.

خۆشەویستی خوا بە شێوەیەکی وا لە دڵتا بچەقێنە کە هەموو گیانت ، ژیانت ، بوون و هەبوونت هەر هەمووی بە خوا پڕی بکەیتەوە... وابکە خۆشەویستی ئیسلام و ئایینەکەت بەسەرتا زاڵ بێت...

ئەوسا بە ویستی خوا دەتوانی بەبێ کەسی یاریدەدەر ئارامبگری.

تەکەی ببیتە ئەو گەنجەی دەستی کرد بە هەڵسانەوە و ڕاستبوونەوە ،کاتێکیش کە یاریدەدەرێکی نەدۆزییەوە سەبر و ئارامی نەما و کەوتە داوی گوناهەوە...

لە منی وەرگرە:

(ئەگەر لە جیهاندا کەس نەما گوێڕایەڵی خودا بکات...ئەوا تۆ گوێڕایەڵی خوا بکە و فەرمانبەرداری ئەو بە)...

ئەگەر هاتوو هەموو خەڵك دونیای هەڵبژارد...ئەوا تۆ خوا هەڵبژێرە وە ئەو ئایەتەی خوات لە بیر بێ کە دەفەرموێ:

﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ﴾[1].

واتە: (ئەو زاتە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروستکراوانی نێوانیانە، کەواتە هەر ئەو بپەرستە، زۆر بەردەوام و خۆگر بە لە پەرستنیدا).

ئەی خوا شایستە و شایەنی ئەوە نییە کە بیپەرستی و لەسەر پەرستنی ئەودا بەردەوام و کۆڵنەدەر و خۆگر بیت؟ ، هەتا ئەگەر هیچ پشتیوانێك و یاریدەدەرێکت نەدۆزییەوە.

**گەورەترین پلە و پایەی ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵییەکان...!!**

گەورەترین پلە و پایەی ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵییەکان، ئارامگرتنە لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە لە پێناوی خوا بەسەرت دێت و دووچاری دەبیتەوە... ئەویش پلە و پایەی پێغەمبەرانە... پێغەمبەرﷺ کاتێك بەسەر کەس و کاری یاسردا تێدەپەڕێت دەفەرموێ:

(ئەی کەس و کاری یاسر خۆتان بگرن و ئارامبگرن بە یەکگەیشتنەوەمان لە بەهەشتە)[2] . ئەوان زۆر بە خراپی ئازار

[1] سورة مريم:٦٥.

[2] رواه الحاكم في "المستدرك" (الحديث:٣/٣٨٣).

دەدران، بەڵام ئارامیان گرت. خاتوو سومەییە یەکەم شەهیدە لە ئیسلامدا ، کە زۆر بە سەختی ئازار درا پاشان ئەبو جەهل بە نێزە لە داوێنی دا و کوشتی.

ئارامگرتن بۆ پابەندبوون لەسەرحەق و ڕاستیەکان لە پێناوی خوا هیچ پاداشتێکی نییە بەهەشت نەبێ.

بەڵام بە ڕاستی ئارامگرتنێکی گەورەیە.

خوای گەورە لە سورەتی لوقماندا دەفەرموێ:

﴿يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ﴾[1].

واتە: (کوری شیرینم نوێژەکانت بە چاکی ئەنجام بدە، فەرمان بە چاکە بدە، قەدەغە لە گوناه و خراپە بکە، و ئارامبە لە بەرامبەر ئەو ناخۆشییانەی کە تووشت دەبێت)

وە هەروەها لە سورەتی ئەلعەسردا دەفەرموێ:

﴿وَالْعَصْرِ ۞ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ۞ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾[2]

واتە: (سوێند بە زەمانە، سوێند بە کاتی عەسر، بەراستی ئادەمیزاد لە زەرەرمەندی و خەسارەتمەندیدایە، بێجگە و تەنها

---

[1] سورة لوقمان:١٧

[2] سورة العصر:١-٣

ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە و ئامۆژگاری یەکتریشیان کردووە کە هەمیشە پابەندی حەق بن (پابەندی حەقیش پێویستی بە خۆگری هەیە)، لەبەر ئەوە بەردەوام ئامۆژگاری یەکتریان کردووە تا هەمیشە و بەردەوام، خۆگر و ئارامگریش بن).

## بەسەرهاتێک کە دڵ بۆی گریاوە... !!

گەورەترین نموونەی ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی لە پێناوی خوا... ژنە قژداهێنەرەکەی (ڕازێنەرەوە) کچەکەی فیرعەونە، ڕازێنەرەوە بە زبانی ئێستامان واتە (کوافیرە) ئەوانەی کە لە سالۆنی ژنان ئیش دەکەن). ئەو ژنە جارێکیان قژی کچەکەی فیرعەونی دادەهێنا، لە پڕێکا شانەکە لە دەستی کەوت و گوتی: بسم الله (بەناوی خوا)(هەڵەی کرد... ئەو ئیمانی خۆی شاردبۆوە و دەرینەدەخست... بەلام ئەمە حاڵمانە (ڕەوشتەکانمان ڕیسوامان دەکات) کچی فیرعونیش ووتی: خوا ! باوکمە؟ ژنە قژداهێنەر ووتی: پەروەردگاری من پەروەردگاری تۆ و پەروەردگاری باوکت خوایە، کچەکەش گوتی: ئایا خوایەکت هەیە جگە لە باوکم؟ ژنەش ووتی: پەروەردگارم و پەروەردگارت و پەروەردگاری باوکت هەرخوایە، کچەش ووتی: دەبێ ئەم هەواڵە بە باوکم بگەیەنم...ئیتر ئەم هەواڵەی گەیاندە فیرعەونی باوکی، فیرعەون پێی ووت: خوایەکت

هەیە جگە لە من؟! ئەویش ووتی: پەروەردگارم و پەروەردگاری تۆ خوایە، فیرعەون پرسی: ئەوە منالّی هەیە؟ ووتیان: بەلّێ چوار منالّی هەیە یەکێکیان کۆرپەی شیرەخۆرەیە، فیرعەونیش ووتی: بیانهێنن بۆم و شێوە چالّێك لە مس بێنن ئاگر لە ناوی بەردەن هەتا بلّق دەدا ودەتاوێتەوە...

هەر بە خەیالّ خۆت لە جێگای ئەو ژنە دانێ بزانە چی روودەدات.

فیرعەون کورە گەورەکەی هێنا، پێی گوت: خوای ترت هەیە جگە لە من؟ ژنەش ووتی: پەرەوەردگارم و پەروەردگارت خوایە، یەکسەر کورکەیان برد و خستیانە ناو ئاگرەکەوە وە لە پێش چاو دایکەکە کورە هاواری لێ بلّند بوو هەتا بوو بە خەلّوز و توایەوە و نەما... ئینجا دووەم منالّیان هێنا و سێیەمیان هێنا هەر هەمان رووداوی براکەیان بەسەر هات... ئەوانە هەر هەمووی لەبەر چاوی دایکەکە، جا نۆرەی کۆرپە شیرەخۆرەکە هات ، جا سۆز و بەزەیی دایکەکە بۆ ئەو بێچووە وای کرد کە داوێنگیری فیرعەون بێت و نەیەلّێت بیسووتێنن ، یەکسەر لێرە کۆرپەی شیرەخۆر کەوتە ئاخاوتن بە دایکی وت: دایکە ئارامبگرە تۆ لەسەر حەقی...

ئیتر دایك و کۆرپەیان بەیەکەوە فڕەدا ناو ئاگرەکەوە.

سەیر دەکەم ئەم چیرۆکە زۆر کاری تێکردن و ئازارێکی زۆرتان پێ چەشت، دە فرمێسکەکانتان بسڕنەوە..پێغەمبەرﷺ لە

گەشتی ئیسرا و میعراجدا دەفەرموێ: (لەو کاتەی وا مـن بـۆ ئاسمـان بەرز دەبوومـەوە بـۆنێکی زۆر خۆشـم بـۆن کـرد کـە لـەوەوپێش قـەد بۆنی وەکو ئەوم بۆن نەکردبوو، گوتم ئـەی جبرایـل: ئـەو بۆنـە چـی یە؟ گوتی: (ئەوە بـۆنی ژنـە قژداهێنەرەکەی کـچی فیرعـەون و هـەر چوار منداڵەکەیەتی).

ئەی خوایە!!چاوەکان هەم بۆ غەم و خەفەت هەم بـۆ خۆشـی فرمێسك دەرژێنن.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾[1].

واتە:(بە ڕاستی تەنها خـۆڕاگران پاداشـتیان بـێ سـنوور و بـێ ژمارەیە)[2].

ڕاستە...گەورەترین ئارامگرتن... ئارامگرتن لە پێناوی خوا و بۆ ئایینی خوایە...

لێرەدا بەشی دووەمیشمان تەواو کرد و کۆتاییمان پێ هێنـا... تەنها بەشێك ماوە کە ئەویش دوا بەشە.

---

[1] سورة الزمر:١٠

[2] سورەتی ئەلزومر:١٠(تەفسیری ئاسان).

## ئەوە كێیە هەموو جۆرەكانی ئارامگرتنی تیا كۆبۆتەوە...!؟

ئایا ئەو كەسە كێ بووە كە توانیویەتی هەموو جۆرەكانی ئارامگرتن لە خۆیدا كۆ بكاتەوە ،هەمیشە و بەردەوام لەسەر موسیبەتەكان ، لە ستەم و گوناهەكان و لەسەر گوێڕایەڵییەكان ئارامی گرتووە ؟ ئەو كەسە پێغەمبەرمان و خۆشەویستمان موحەممەد ﷺبووە... لە هەموو خەڵكی ئەم سەر زەمینە زیاتر تاقی كراوەتەوە... ئەو هەتیو بوو... شوانكاری كردووە... پاشان بەشەو بە ڕۆژ بانگەوازی بۆ خوا كردووە و فەرمانی پێداوە، هەتا خاتوو خەدیجەی خێزانی پێی دەڵێ: كاتی ئەوە نەهاتووە بخەوی ؟ ئەویش ﷺ دەفەرموێ: (كات و سەردەمی خەو ڕۆیشت و بەسەر چوو ئەی خەدیجە)...ئینجا حەوت منالی دەمرێ و دوا هەمینیان ئیبراهیم بوو كە ئەوەندەی خۆشدەویست، لە زۆر خۆشەویستی و دڵخۆشی بەو كوڕە وای لێ هاتبوو هەر لەگەڵ خۆی دەیبردە ماڵی هاوەڵانی و دەیفەرموو: ( ئیبراهیمی كوڕمتان بینیوە)!؟.

ژن و پیاوی ئێستا ئەگەر كوڕێك یان كچێكیان بمرێ ئەوا بە درێژایی تەمەنیان بۆی دەگرین...

پاشان هەردوو كچی ڕوقیە و ئوم كەلسوم بە فەرمانی ئەبولەهەب تەلاق دەدرێن ئەوە پاش ئەوەی ﷺ پێغەمبەرایەتی

خـۆی ڕاگەیانـــد،..کــە هــەردووکیان خێزانــی هــەردوو کوڕەکــەی ئەبولەهــەب (عوتبــە و عەتیبــە) بــوون کــە (تــەنها مارەیــان براببـۆوە)...دوای ئــەوە خۆشەویــسترین و وەفــادارترین خێزانــی لــێ دەمرێ... خاتوو خەدیجە...

ئەی خوایە ئەو هەموو تاقیکردنەوانە چین ؟! چیتر...؟

پێغەمبەرﷺ بە ناموس و شەرەف تاقی دەکرێتەوە... بیر لە قەبارەی ئەو تاقیکردنەوەیە بکەوە کە بگاتــە ئــەو ئاســتە کــە بڵێن؛ خێزانی پێغەمبەرﷺ داوێن پیـسی و فاحـشەی کـردووە... هەمیـشە گـوێ بیـستی ئـەوەین کـە (هـیچ دوکـەڵێك بـێ ئـاگر نـیـیـە)...بـەڵام ڕووداوی درۆ و قسە هەڵبەستان لەسەر عائیشەی خێزانـی پێغەمبـەر ﷺ (دوکەڵێکی بێ ئاگر بوو)...چیتر...؟

پێغەمبـەر لـە پێنـاوی خـوا لێـی دەدرێ و ئـازارو ئەشـکەنجە دەدرێ ﷺ، کاتێك کـە کـافران لای کەعبـە بینیـان لـە سـوژدە بردنـا بوو هەناو و ڕیخۆڵەی ووشترێکی مردوویان هێنا و فڕێیـان دا سـەری یەوە هەتا نەیتوانی سەری بەرز بکاتەوە،...وە لەو ڕۆژە کە دەچێ بۆ تـائیف بـەرد بـاران دەکـرێ و جنێـوی پـێ دەدرێ...پێغەمبـەرﷺ دەفــەرموێ؛ (وەهــا ترســێنراوم لــە پێنــاوی خــوا کــە کــەس وا نەترسێنراوە، وەها ئازار و ئەشکەنجە دراوم لە پێناوی خوا کە کـەس وا ئازار و ئەشکەنجە نەدراوە وە ٣٠ ڕۆژم بەسەرا هات لـە نێـوان هـەر شـەو و ڕۆژێــك ج نــەبوو بخــۆم تــەنها ئــەو خواردنــەی بــیلال بــە

زەحمەتی و بە نهێنی بۆی دەهێنام کە لە بن باڵی شاردبوویەوە ) [1] ...

وە لەبەر زۆری برسێتی دوو بەردی لەسەر سکی دەبەست... مانگێك بەسەریا تێدەپەڕی پاشان مانگێکی تر پاشان مانگێکی تر پاشان مانگێکی تر کە هیچ ئاگرێك لە ماڵەکەیا هەڵنەدەکرا (بۆ چێشت لێنان)... تا وای لێهات لە کۆتایی تەمەنیا گەیشتە ئەوپەڕی بێ هێزی ولاوازی وە لەبەر بێ تاقەتی بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد...

خاتوو عائیشە دەفەرموێ: (هیچ کەسێکم نەبینیوە ئەوەندە بە ئێش و ژان و بەئازار بێت لە نەخۆشی وەکو پێغەمبەرﷺ) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەرﷺ بە ڕەزامەندیەوە سوپاسگوزار و ستایشی خوای دەکرد و دەیفەرموو:

(خوایە من ناتوانم حەمد و سەنای تۆ بژمێرم وەك ئەو حەمد وسەنایەی کە خۆت بۆ خۆت کردووە و بۆ خۆت فەرمووتە) [2] ... جا ئەوەندە دڵی بە خوا خۆش بوو کە وای لێ کردبوو پێویستی بە دونیا نەبێت.

---

[1] رواه الترمذي في (الحديث:٢٤٧٢) ، وابن ماجه في (الحديث:١٥١)، والإمام احمد في (الحديث:٢/٢٨٦).

[2] رواه الإمام احمد في (الحديث:٦/٥٨).

وه خۆی بۆ خوا یەك لا كردبۆوه كه له هەموو كارێكدا هەر خوای مەبەست بوو...

بە ڕاستی وەسفێكی تەواوە كە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[1].

واتە: (سوێند بە خوا بە ڕاستی لە پێغەمبەری خوا ﷺ چاكترین نموونەی تەواو و ڕێك و پێك هەیە تا چاوی لێبكەن و شوێنی بكەون).

## ئیماندار ئاوێنەی براكەیەتی

تاوەكو ئیماندار ئاوێنەی براكەی بێت... ئەوا پێویستە ڕاشكاوی و ڕوونی و ئاشكرایی هەبێت... هەرگیز نەكەی و نابێ تووڕە بیت...

ئەی ورە نزم و خاوەن بڕیارە لاوازەكە... ئەی ئەوەی ناتوانێ واز لە جگەرە بێنێت... ئەی ئەوەی لە بەرامبەر گوناه وتاوانەكان خۆی ناگرێ... ئەی ئەو كەسەی ناتوانێ لەسەر گوێڕایەڵی خوا ئارامبگرێ...لە پێغەمبەرانی خودا فێربە... سەیری ڕێگاو ڕێڕەوی ئیسلام بكە...ئەو ڕێگایەی پێغەمبەر نوح گریان و شیوەنی بۆ كردووە، ئیبراهیم بۆی فڕێ دراوەتە ناو ئاگرەوە یەحیا بۆتە قوربانی ئەم پەیامە و سەری بڕاوە و زەكەریای باوكی بە بڕەرەوە

[1] سورة الاحزاب:٢١

(منشار) دوو کەرت کراوە و موحەممەدی مصطفیﷺ بۆی ئازارو ئەشکەنجە دراوە... سلاو لە گیانی پاکی هەموو پێغەمبەرانی خودا.

پاش ئەو هەموو ڕووداوە ڕاستی یە تۆش لە یاریکردنای ، خەریکی ڕابواردنی و بێ ئاگای... ئەی تۆ خوشکی بەڕێزم کە دەڵێی: (ناتوانم حیجاب بکەم و بالا پۆش بم چونکە خۆگرنیم و لە نارامگرتنا لاوازم)

سوودتان لەباس وبەسەرهاتەکانی پێشوو وەرنەگرت...؟ ئەیگەنجان... کچەکان... کوڕەکان...؟

ئەم نزایە چەند خۆشە...!!

ئەم نزا قورئانیە چەند خۆش و بەچێژە:

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْراً﴾[1].

واتە: (پەروەردگارا، خۆگری و ئارامگریمان پێ ببەخشە) [2].

ووشەی (افرغ) - واتە پڕمان بکەوە لە ئارامی وخۆڕاگری...

ئەی ئەوانەی کە ڕاهاتوون لەسەر تلیاك و مادده بێ هۆشکەرەکان ،ئێستا دەتوانن پەشیمان ببنەوە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە لای خوا ، ئێستا دەتوانن بە تەواوی واز لەو مادده زیان

---

[1] سورة البقرة:٢٥٠

[2] سورەتی البقرە:٢٥٠ (تەفسیری ئاسان).

بەخشانە بێنن و دەستی لەسەر هەڵگرن...وە بە چەکی ئارامگرتن دەتوانن نەفسی خۆتان بە هێز و بەتین بکەن... هەروەکو ئەو پیاوەی ٤٠ ساڵ جگەرەی دەکێشا ئەوجا پاش ئەو ماوە درێژە جگەرەی لەخۆی قەدەغە کرد و ئارامی گرت و خواش پشتیوانی بوو.

پێویستە هێز و توانایەك لە خود و ناخی خۆت بەرپا بکەی هەتا ئەگەر کەسێك نەبوو پشتیوانت بێت و هاندەرت بێت... هێز و توانایەکی ناخی خۆت کە وات لێبکات هەموو شتێك بکەیت لە پێناوی گەیشتن بە گەورەترین مراز و ئاوات کە ئەویش بەهەشتە... هەر ئەوەندەشت بەسە لەسەر ئارامگرتن بچەسپێی... بەرێزم دونیا کورتە سەرەتاکەی گریانە ناوەراستەکەی کۆشش و ماندووبوونە کۆتایی یەکەشی لە ناو چوونە و نەمانە...

ئەوەش بزانە کە ئامانج و ئاواتە گەورەکان ڕێگاکەی بڵند و سەختە و ماندوو بوونێکی زۆری دەوێ...

ئەگەر ئامانج و مەبەستی هەرە گەورەمان بەهەشت بێت ئەوا ئەو ڕێگا بەرزەش کە دەمانگەیەنێتە ئەو بەهەشتە ئارامگرتنە.

(خوایە گیان بە ئارامگرتن دامانپۆشە)...

## ئەی دونیا...غەیری من هەڵخەڵەتێنە

گـەورەمان عـەلی (علیـه الـسلام) دەفـەرمێ: (ئـەی دونیـا غەیری من هەڵخەڵەتێنە و لە خشتەی ببە ئەی دونیا مـن سـێ بـە سـێ تـەلاقم داوی... ئـاخ و داخ کـە زادم کەمـە و ڕێگایـەکی دوور ودرێژم لە پێشە)...

بیرێك لە کەمی زاد و دووری ڕێگا بکەوە...

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

(من چیم داوە لە دونیا من لـە دونیـا وەك ڕێبوارێـك وام کـە لە ژێر سێبەری دارێکدا دەحەسێتەوە و پشوو دەدات پاشان دەڕوا و بەجێی دێڵێ).[1]

## چ هۆیەك هانت دەدا بۆ چەسپاندنت لەسەر ئارامگرتن...!؟

ئەم خاڵانەی خوارەوە هاندەر و یاریدەدەرن بۆ جێگیربوونـت لەسەر ئارامگرتن:

١- کورتی دونیا و کورتی تەمەن.

٢- بزانی کە تۆ موڵکی خوای و هەر بۆ ئـەو دەگەڕێیتـەوە، (ئـەو ڕستەیە با هەمیشە و بەردەوام لە بیر و هۆشتا بێت).

٣- بزانە کە پاداشتی ئارامگرتن بەهەشتە و مسۆگەرە.

٤- بڕوایی و دڵنیایی تەواوت بە فەرەج و حەسانەوە و گوشادی.

---

[1] . رواه الترمذي في (الحديث، ٢٣٧٧)، وابن ماجه في (الحديث، ٤١٠٩).

ئەگـەی ئـەم خاڵانـە تـەنها بـۆ باسـكردن و گێڕانـەوە بیانخوێنیتەوە...

بەڵكو ئەندازەگەری هەریەك لەو خاڵانە بكە بە گوێرەی ئەوەندەی كە لێی تێگەیشتویتە سەبارەت بە ئارامگرتن...

دەیپارێزین و لە بیری دەكەین... !!

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً﴾[1].

واتە: (بەڕاستی هاوڕێ لەگەڵ تەنگانەدا خۆشی و ئاسودەیی دێت)... باشە ! ئایا بۆ خوای گەورە فەرموویەتی: لەگەڵ تەنگانە خۆشی و ئاسوودەیی دێت...!! وە نەیفەرمووە (پاش) تەنگانە خۆشی و ئاسوودەیی دێت.

پاكی و بێ گەردی بۆ خوا...!! ئەگەر تەنگانە و ناخۆشییەكان كۆترێ بوایە بۆ هێلانەكەی خۆی بگەڕاباوە ئەوا دوای ئەوە خۆشی و شادیش شوێنی دەكەوت...

تەنگانە و زەحمەتی یەكان قەت بە تەنها نایەت... هەرگیز لەگەڵ خۆشی و ئاسوودەیا بەیەكەوە لكاون.

تۆش دەڵێی: من ڕۆژگارێكی دوورە تاقی كراومەتەوە ئەی بۆ هیچ خۆشی و شادییەك نابینم...؟ برای خۆشەویستم تۆ خۆشی و

[1] سورة الشرح: ٥.

شادی یەکەت نەبینیووە بـەڵام هەیـە... بـەخوا ئـەو بـە نەهامـەتی و ناخۆشی یەکانەوە لکاوە وپێیەوە بەندە...

ئێستا سـەرگەردانی و دەڵێـی: ئـەی تـۆ وەڵامـی پرسـیارەکەت نەدامــەوە...وەڵامەکــە لــە نێــوان ڕســتەکاندایە بــرای بــەڕێزم...دە تۆدووبارە بیخوێنەرەوە.

ئاخر خۆشییەکە....ئەوجا تێبگە!

## دڵنیایی تەواوت بە فەرەج و حەسانەوە

## بەڵاکانت لەسەر ئاسان دەکات

گەورەمان یەعقوب کاتێك کـە کـوڕی دووەمـی (بنیـامین) لـە کیس دەچێت دەفەرموێ:

﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْراً فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾[1].

واتە: (جا چارم نی یە، ئارامگرتنێکی جوان نـەبێت، ئومێدە پەروەردگار هەموویانم بۆ بهێنێتەوە و بە هەموویان شاد بم)[2].

ئـەو ئۆمێـدی تـەواوی بـە هاتنـەوەی کوڕەکـانی هـەبوو ئـەو ئومێدەش بوو بەڵاکانی لەسەر ئاسانکردبوو... ئایا تۆش ئاوا دڵنیـایی تەواو و ئومێدی تەواوت بە خوا هەیە...؟! ئەی بۆ ئارامناگری...؟!

ئەی خوایە..!!

---

[1] سورة یوسف:٨٣

[2] سورەتی یوسف:٨٣ (تەفسیری ئاسان).

## کێ خوای ناسیووه به باشترین ناسین !!

کوڕی باوکی عەتای ئەسکەندەری دەڵێ: (ئەوەی گومانی ئەوە ببا کە لوتفی خوا لە قەزا و قەدەریدا نییە ئەوا لە خوا حاڵی نەبووە وخوای نەناسیوە بە باشترین ناسین)

ئایا لەم ووتەیە تێگەیشتی؟

واتە ئەوەی وا گومانی برد کە بەڵا و ناخۆشی یەکان سۆز و لوتف و کەرەمی خوای تێدا نییە، ئەوا بە تەواوی خوای نەناسیوە بە باشترین ناسین...

خوای گەورە دەفەرمێ:

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَاءُ﴾[1].

واتە (بەڕاستی پەروەردگارم بە سۆز و بە لوتفە بۆ هەر شتێك کە دەیەوێت)... وە پەلەی نی یە و بەشێنەیی ڕێگای بۆ خۆشدەکات...

لەگەڵ دەرد و بەڵاکان...لەگەڵ تاقیکردنەوەکان... لوتف و سۆزێکی ئارامگرتن هەیە کە هانت دەدا و یارمەتیت دەدات.

ئایا گومانی ئەوە دەبەیت کە لوتف و سۆز و میهرەبانی خوا دوورە لە هێز و دەسەڵاتی؟!

[1] سورة يوسف،١٠٠.

## کورتت کردەوە و ئەنجامت دا ئەی کوڕی خەتاب

فەرمانڕەوای ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب (علیه السلام) لەسەر ئارامگرتن هانت دەدات و هاریکاریت دەکات کە دەفەرموێ: کە تووشی هەر بەڵایەك بوومە ئەوا بە چوار شت لەسەرم ئاسان بۆتەوە:

یەکەمیان: لەو بەڵایە گەورەتر هەیە (پاکی و بێگەردی بۆ خوا !! بەڵێ ڕاستە دەگونجا بەڵایەکی توندتر و سەختتر هەبوا ).

دووەمیان: بەڵاکە لە ئایینما نەبووە (بەڵێ... هەموو تاقیکردنەوەیەك و بەڵایەك لە ئاییندا نەبێت ئەوە ئاسانە

سێ یەمیان: خوا بەهەشتم بۆ لە جیاتی دادەنێ (جا چ پاداشتێکە کە بۆی ئارامدەگری).

چوارەمیان: تەنگ و چەڵەمەی خۆم نەمان و مردنی پێغەمبەری ﷺ دەخستەوە بیرم (واتە مردنی پێغەمبەر بەلایەوە لە هەموو شتێکی تر گەورەترە).

هەموو ئەو خاڵانەی کە باسکران هەمیشە لە بیرت بێت ئیتر هەر بەڵایەکت بەسەر

بێت ئەوا لەسەرت ئاسان دەبێت...خوای گەورە دەفەرمێ:

﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ﴾[1] واتە:

---

[1] سورة البقرة:١٥٥

(جا مژده بده بەو کەسانەی ئارامگرو خۆڕاگرن).

تێبینییەك/ لە خاڵی دووەمدا ئەوەی کە سەرنجی ڕاکێشام ئەوەیە کە دەمەوێ بڵێم زۆر کەس لە ئێمە هەن کە نازانن ( بەلاّ لە ئاییندا ) مانای چییە وتێیناگا، بەلاّ لە ئاییندا ئەوەیە وەك بڵێی کەسێك بۆ نموونە لە یەك ڕۆژدا نوێژی بەیانی لە کیس دەچێت وە پێنج هەزار دیناری لێ وون دەبێت...ئیتر قەت و هەرگیز ئەو پارەیە لە بیر ناکات کە لێی وون بووە و زۆریش خەفەتی بۆ دەخوات بەلاّم ئاخ و داخ بۆ ئەو نوێژەی کە لە هەمان ڕۆژدا لە کیسی چووە نە خەفەتی بۆ دەخوات نە لە بیریەتی...!!

**قورسترین ئارامگرتن... !! ئارامگرتنێکە کە باری نابەیت !!**

شبلی پرسی: قورسترین جۆر لە ئارامگرتن لەسەر نەفس و گیان چییە؟ ئەوانیش ووتیان: ئارامگرتنە لە بۆ خوا، ئەویش ووتی: نەخێر، ووتیان: ئارامگرتنە لەگەڵ خودا؟ ئەویش ووتی: نەخێر، ووتیان: ئەی چ جۆرە ئارامگرتنێکە کە لەوە زەحمەتترە؟ گوتی: قورسترین جۆری ئارامگرتن... ئارامگرتنە لە خوا.

مانای ئەوەیە: کە تۆ خوا لە بیر بکەیت... فەرمان و قەدەغەکراوەکانی لە بیر بکەیت و فەرامۆشی بکەیت...

ئەی خوایە!! ئەوسا ئارامدەگری لەسەر گوێڕایەڵی شەیتان و ئارامناگری لەسەر گوێڕایەڵی خوای ڕەحمان!!...ئارامدەگری لەسەر هەژاری و نەبوونی و زەحمەتی ژیان وە لەهەمان کاتا ئارامناگری لەسەر ڕازی کردنی خودا و باراندنی ڕەحمەتی بەسەرتا...!

## لە کۆتاییدا

ئەی خوێنەری خۆشەویست... ئەوا ڕەوشتی ئارامگرتن بوو...کە بەشی سێیەم و دوا بەش کۆتاییی هات... وا بزانم بەردەکە لاکەوت و دەرگای ئەشکەوتەکە کرایەوە...

ئایا ئارامدەگرین و ڕاستەڕێ دەبین؟ ئایا بە خۆمان پاڵ بە خۆمانا ئەنێین بۆ ئارامگرتن وە یان کەسێکی یاریدەدەرمان پێویست دەبێ؟

به خوا ئەوەی بیەوێ ئارامبگرێ ئارامدەگرێ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

(ئارامگرتن بەوە دەبێت کە خۆت لێ ڕابێنی لەسەر ڕەوشتی ئارامگرتن)[1]

دە بۆ خۆت فێر بە و خۆت لێ ڕابێنە لەسەر ئەم ڕەوشتە خواش پشتیوانت دەبێ و بەهاناتەوە دێت...ئەوجا بەئیزنی خوا ژیانت پڕ دەبێت لە خێرو خۆشی و بەختەوەری.

[1] رواه ابن حجر في "فتح الباري" (الحديث١١/١٦١) .

# (( ڕەزاسووکی ))

# سەلیقە وخوڵق وخووی دروست لە گفتوگۆ و مامەڵەکردندا

## ڕەوشتێکە لە ئیسلامدا هەڵقوڵاوە وسەری هەڵداوە

ئەو ڕەوشتەی کە ئێستا باسی لێوە دەکەین و ڕایدەنوێنین لات گرانە و هەرگیز ڕازی نابیت بەوەی کە ڕەوشتێکی ئیسلامی بێت !! تەنانەت ئەگەر وا وترا سەرت سوڕدەمێنێ. بۆ نموونە تۆ لەو بڕوایەدای کە ڕەوشتی خۆنەویستن ڕەوشتێکی ئیسلامىیە ئەگەرچی لە واتاکەشی تێنەگەیشتبی...بەلآم بیرو بۆچوونت سەبارەت بە (سەلیقە وخوڵق وخووی دروست لە گفتوگۆ و مامەڵەکردن) بەپێچەوانەیە... واتە هەرچەندە باش شارەزای ئەو ڕەوشتەیت و هەڵسوکەوتیشی پێدەکەیت بەلآم هەرگیز نازانی کە ئەوە ڕەوشتێکی ئیسلامىیە ،کاتێك کە دەڵێین : ڕەوشت بەرزی ، هەستیاری لە مامەڵەکردندا ، هەست ناسکی ، هەڵسوکەوتی دروست وجوان لەگەڵ خەڵکدا ، شارستانیەت...یەکسەر دەپرسی و دەڵێی: ئاخر ئەوە چ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە هەیە؟

زۆربەمان وای بۆدەچین کە ئەم ڕەوشتە لە ئیسلامدا نەناسراوەو نامۆیە...!!

هەر لەبەرئەوە دەمانەوێ نیازی سەرەکیمان ئەوە بێ کە بگەینە ئاستێکی وەها کە زۆر لەو هەڵانەی هەن ڕاست بکرێنەوە ودواتر بیسەلێنین کە ئەم ڕەوشتە ڕەوشتێکی ئیسلامیەیەو لە ئیسلامدا سەری هەڵداوە...!!

**مەبەست چییە لە ڕەوشتی خوڵق و خووی دروست...!؟**

مەبەست لە ڕەوشتی خوڵق و خووی دروست لە گفتوگۆ و مامەڵەکردندا: چۆنیەتی مامەڵەکردن وئاخاوتنە لەگەڵ خەڵکدا...ڕێزگرتنی نرخ و بەها جوانەکان...گیانێکی جوان و پاك... هەست ناسکی... پاك و خاوێنی...ڕێك و پێکی...ڕووتەنکی و ڕوونەرمی کە تەنها بە تیلە و سەرنجی چاوەکان و بە بزمیەکی سەر لێو لە هەڵەکان تێدەگا و پێشبینی ڕوودانی دەکات.

ئێمە چەندین سات لەگەڵ چەندین ووشەی نەرم وناسك ژیاوین، کە هەستەکانی مشتومال کردوە و دڵەکانی نەرم کردۆتەوە، کە هەمووی هاوواتان بۆ ووشەی زەوق وسەلیقە.

وا بزانم شیرینترین و جوانترین دەستەواژە لەوانەی پێشتر کە خوێندمانەوە ئەمە بوو: (ڕووتەنکی و دەروون نەرمی، کە تەنها بە

سەرنجی چاوەکان و بە بزەیەکی سەر لێو لە هەڵەکان تێدەگا و پێشبینی ڕوودانی دەکات).

ئەی خوایە ئەمە چ هەستێکی ناسکە...!! خوایە بمانخەیە ڕیزی ئەو کەسانەوە.

ئایا تۆ لەو کەسانەی...!؟

بەداخەوە...ئەو کەش و دۆخە خۆشەی کە هەستەکانی پێ بەرز دەبێتەوە وازت لێهێناوە وجێت هێشتووە.

هێشتا هەر سووریت لەسەر هەڵوێستەکەت و دەڵێی:

ئاخر ئەوە چ پەیوەندییەکی بە ئایینەوە هەیە؟

بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : شەرم (الحیاء) بەشێکە لە ئیمان...باشە ! ئەی ئەوەی بە تەماشایەك یا بە خەندەیەك لە هەڵەکان تێدەگا ، ئایا ئەوە کەسێکی بەشەرم و بە ئابڕوو نییە!!؟

**هێشتا هەر ڕوون نەبۆتەوە...!!**

هێشتا هەر هەست بەوە دەکەی کە ڕەوشتی خوڵق وخووی دروست لەمامەڵەکردن و گفتوگۆدا زۆر دوورە لە ئیسلام، بەڵکو لەوە زیاتریش دەڵێی: ڕەوشتی بەرز، هەست ناسکی، گیانی پاك و جوان، شارستانیەت، پێشکەوتن، سەرکەوتن، چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکدا، ئەوانە هەر هەمووی لە زانکۆکانی جیهان دەخوێنرێت کە تایبەتە بۆ دبلۆماسیەکان، چونکە ئەوان ئەبێ فێری

ئەم جۆرە ڕەوشتە ببن لەبەرئەوەی پێویستیان پێیەتی...واتە لە قوتابخانە بیانی‌یەکان گرنگی بە خوێندن و فێر بوونی ئەم جۆرە ڕەوشتانە دەدرێت.

خوێنەری خۆشەویست ئەم دەستەواژەیە لە دڵتا بنەخشێنە: (ئەم ڕەوشتە ڕەوشتێکی سەرەکی ئیسلامی‌یە)...دەرفەتیش زۆرە بۆئەوەی لەسەری بدوێین و باسی لێوە بکەین وفێری ببین...فێر بوونیش بە بچوکی وەکو نەخش و نیگاری سەر بەردە!؟

## چوار چینە خەڵک...!!

لە باسکردنی ئەم ڕەوشتەدا نامە بۆ چوار چینە خەڵك دەنێرین کە بە گشتی لە کۆمەڵگای موسوڵمانانندا هەن، چونکە لەو بابەتەدا ئەوانمان مەبەستە.

خوێنەری خۆشەویست ئەوە بزانە کە تۆش یەکێکی لەم چوار چینە.

دەی ئامادەبە بۆ وەرگرتنی نامەکە.

### یەکەم چین

یەکەم چین کۆمەڵە خەڵکێکن بیرو باوەڕیان وایە کە خووی دروست لە مامەڵەکردن، ڕەوشت بەرزی ، سەرکەوتن ، پێشکەوتن و شارستانیەت ئەوانە هەر هەمووی بەهای ڕۆژئاواییین ، ئێمەش لەوان فێر بووینە لە ڕێگای قوتابخانە بیانی‌یەکانەوە...

بۆنموونه باوکەکە دەڵێ: دەمەوێ کوڕەکەم لەوپەڕی سەلیقەو خووڕەوشتا بێت، لەبەرئەوە دەینێرم بۆ قوتابخانەی بیانی...!!

ئەوەیان یەکەم چینن، کە دەمەوێ نامەیان بۆ بنێرم وپێی بڵێم : ئەی ئەو کەسەی، کە باوەڕت وایە کە ڕەوشتی بەرز و پێشکەوتن لە بەهای شارستانیەتی ڕۆژئاوایییەکانە کە ئێمە لەوانمان وەرگرتووە، ئێستا دەزانی ئەو بیر و باوەڕەت هەڵەیە.

**دووەم چین**

دووەم چین یان دووەم کۆمەڵ: ئەو کۆمەڵە خەڵکەن کە لەسەر داب و نەریت و سەلیقەی جوان و پێشکەوتن و ڕەوشتی بەرز پەروەردەکراون بەڵام وا دەزانن کە ئیسلام بە تەواوی پێچەوانەی ئەمانەیە، جا کاتێك گوێی لە وشەی (دیندار - متدین) دەبێت، پێی وایە مانای: ناشایستەیی،جل و بەرگی نارێك، زەوقی نزم، بێ سیستەمی و شپرزەیی دەگەیەنێ...

زەوق لای ئەو بۆتە بەربەستێك لە نێوان خۆی و دینداری.

ئەم چینە خەڵکە لە کۆمەڵگادا کەم نین، لەوانەشە بەهانەی هەبێت و نەزانێت وناشارەزا بێت...بە ویستی خودا نامەکەمان بۆ ئەو لە جێگای خۆیدا دەبێت وبەربەستەکەش دەشکێت...ئیتر هەرکە زانی ئەم ڕەوشتە سەرچاوە بنەڕەتی یەکەی ئایینەکەی خۆمانە ئەوسا بە ئیزنی خوا بڕوا دەهێنێت و دیندار دەبێت.

## سێیەم چین

سێ یەم چین چینێکن گومانیان وایە کە ئیسلامەتی تەنها لە ناو مزگەوتە...!! وە دروشمی ئەم چینە: (ئەوەی بۆ خوایە لێیگەڕێ با بۆ خوا بێت و وە ئەوەی بۆ قەیسەرە با بۆ قەیسەربێت)...لە دوایشدا پێی وایە کە ڕەوشت و پێشکەوتن و شارستانیەت و هەموو هەڵسوڕانی ژیان هیچ پەیوەندی یەکی بە ئایینەوە نی یە...!!

لە دڵەوە نامەیەکی تایبەتی بۆ ئەم جۆرە کەسانە دەنێرم و پێیان دەڵێم: ئەوەی بۆ خوایە بۆ خوایە، وە ئەوەی بۆ قەیسەرە هەر بۆ خوایە.

پاشان دەزانی و بۆت دەسەلمێنرێ، کە بناغەی سەرەکی ڕەوشتی جوان و شارستانیەت و پێشکەوتن لە ئایینی خۆمانایە، جا ئەگەر بناغەی ئەم شتە سادە و ساکارانە لە ئایینەکەی ئێمەدا بێت، ئەی شتە گەورەکانی کە پێویستن بۆ هەڵسوڕانی کاروباری ژیان ، ئایا بنچینەکەی بۆ ئایینەکەمان ناگەڕێتەوە!؟...باش بزانە کە ئیسلام هاتووە بۆ ڕێکخستن و هەڵسوڕانی هەر هەموو کاروباری ژیان .

## چوارەم چین

دوا چین لە چینەکان کۆمەڵە خەڵکانێکن لە گەنجی دیندار و خواناس، کە وا تێگەیشتووە ئیسلام تەنها خواپەرستی... نوێژ و ڕۆژوو... زیکر و ستایشکردن و تەسبیحاتی خودا و یاد و باسی خوا و

کڕنـوش بردنـه...نـه زیـاتر...ئـەو جـۆرە کەسـە زۆر بـە پەرۆشـی خواپەرستی یەو سوورە لەسەر ئەوەی کە خوا ڕازی بکات و وە باشی ئاگای لە گوێڕایەڵییەکانە...

بـەلام ئـەو وا تێنەگەیـشتووە کـە خوڵق وسـەلیقەی دروسـت لەمامەڵـەکردن ڕەوشـتێکی ئیـسلامی یـە وە لـەو بەهایانەیـە کـە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی...کە سـەیری ئـەم گەنجـە دەکـەی دەبینـی بـە توندی و بـە ڕەقـی مامەڵـە لەگـەڵ خـەڵك دەکـات، کـە ئـەوەش مامەڵەیـەکی بـێ سـەلیقەیە (عـدم الذوق)، دەرئـەنجامی ئەمـە سـێ چینە خەڵکەکەی تر فریو دەدات و لەخشتەیان دەبات وە بە هەڵە بۆ ئیسلامیان دەبات...ئیتر دینداریەکەی دەبێتـە هـۆی دوورکەوتنـەوەی خەڵك لە ئیسلام... بـۆ نموونـە دایـك و بـاوکی دەڵێن؛ لـەوەتای ئـەو کوڕەمـان دینـداربووە تونـد و ڕەق و تـووڕە بـووە...بایـەخ بـە جـل و بەرگی نادات... توخوا سەیری شێوەی بکە...!!! ئەی بۆنی...!!

نامەیەك بۆ ئەم جۆرە کەسانە ئاراستە دەکەم، کە فرمێسك لە چاوان دێنێتە خوارەوە...پێی دەڵێم؛ تکایە بە تەواوی و بە ڕاستی لە ئیسلام تێبگە، ئیسلام هەموو شتێکە و بەش بەش ناکرێ...توخوا وەك چۆن پێغەمبەرﷺ هێناویەتی ئاوا لـە ئیـسلام تێبگـەو...بزانـە کە سەلیقەی گفت ورەفتار بەهایەکە لە بەها گرنگەکانی ئیسلام.

مەبەستمان لەم ڕەوشتە:

پێم وایە چۆنیەتی ئاخاوتن و مامەڵکردن لەگەڵ خەڵكدا لە ڕەوشـــتە گرنگەكانـــە هـــەروەك ڕەوشـــتەكانی تـــر ، وەك ڕاستگۆیی...خۆگری و ئارام گرتن...دەستپاكی.

دەمــەوێ پــاش باســكردنی گرنگــی و ڕوونكردنــەوەی ئــەم ڕەوشتە وا لە مەسەلەكە بێینە دەرەوە كە بڵێین ((سوپاس و ستایش بۆ خوا لەسەر نیعمەتی ئیسلام))

سوپاس و ستایش بۆ خوا كە سەر بەو ئاینە پیرۆزەین، ئاینی ئیسلام.

ئازیزان، مەبەستمان لە باسی ئەم ڕەوشتە ئەوەیە كە شانازی بـە ئـاین و ئیـسلامەتی خۆمـان بكـەین...چـۆن شـانازی ناكـەین، كـە ئاینمـان ئـاینی میهرەبـانی و بـەزەیی و ئاشـتی و شـادی و سـەلیقەی جوان و ڕەوشتی بەرزو شارستانیەتە؟

خۆشەویـستان...ئێمــە بـۆ ئـەم ڕەوشـتە لـە خـەڵكی تـر لـە پێشترین.

سەرچاوەی ئەم ڕەوشتە بۆ ئیسلام دەگەڕێتەوە.

لەو كاتەی ووتمان، تۆ یەكێكی لەم چوار چینە خەڵكەی كە لەوەوپێش باسكران، مەبەستم ئـەوە نـەبوو كـە بـە تـۆ بڵێم خوڵق وسەلیقەت نی یە...نەخێر، بە خوا زۆر دڵنیام كە تۆ لەسەر سـەلیقە

و ڕەوشتی بەرز پەروەردەکراوی، بەڵام دەڵێم: تۆ وەکو پەروەردەی ماڵــەوە لەســەر ئــەم ڕەوشــتە پــەروەردەکراویت، نــەك وەکــو پەروەردەیەکی ئیسلامی کە ئیسلام فەرمانی پێداوە.

بەڵێ زۆرێك لە ئێمە لەسەر خورەوشت و ڕەفتاری بەرز پــەروەردەکراوە، نــەك لەبەرئــەوەی ئیــسلام وا دەڵێــت، بــەڵکو لەبەرئەوەی نەریت وا دەڵێ، بەڵام ئێستا دەزانین کە سەرچاوەی ئـەم ڕەوشتە بۆ ئیسلام دەگەڕێتەوە.

## پەیڕەو و بەرنامەمان لەم ڕەوشتەدا

لەم لاپەڕانەی داهاتوودا لە میانی جێبەجێ کردنی کرداری لە ڕەوشتی سەلیقە وخووی بەرز دەدوێین ، واتە بۆ چەند بابەتێکی جۆراوجۆر دابەشی دەکەین، کە هەر بابەتێك بەشێك لە ژیانی واقیع دەگرێتە خۆی، ئینجا باس دەکەین کە چۆن ئیسلام ڕەفتاری لەگەڵ کردووە و لە میانەی ڕێژین (سیرە) ی پێغەمبەر ﷺ و ڕەفتارو کردەوەی هاوەڵەکانی و وە لە ڕێگای ڕەوشتی شوێنکەوتووانی بۆ ئەوەی بە پێی ڕەفتاری ئەوان پەروەردە بکرێین، وە خوڵق وخووی ڕێك وجوان لەوان وەربگرین و فێربین وە پەیڕەوی ئەوان بکەین.

خوێنەری خۆشەویست دەی با لەسەرچاوە سەرەکییەکەوە ئەم ڕەوشتە ببین.

بزانە کە کانیاوی ئیسلام کۆتایی نایەت

ئەی ئەو کەسەی وا دەگەڕێ، کوا تۆ لە کوێی...؟!

## ڕەوشت لەگەڵ ئەدەب

ئەوەی ڕاستی بێت دەرەنجامی خستنەڕووی تەواوی مەسەلەی خولق وخووی دزوست لە مامەڵەکردن لە ئایینی ئیسلامدا زۆر شتی گەورەی لێ دەبێتەوە کە لەم لاپەرە کەمانە خۆی ناگرێ و سەرژمێر ناکرێ ، لەبەر ئەوە بە باشمان زانی کە بە کورتی و پوختی ڕێکی بخەین...

بە ویستی خوا یەکەم بەشی بابەتەکەمان لە ماڵەوە دەست پێ دەکات.

## خولق و سەلیقەی مامەڵەکردن لەگەڵ دایک و باوک

یەکەمین کەس لەگەڵیان دەست پێ بکەین لە ماڵەوە دایك و باوکە، لێرەدا مەبەستم گوێڕایەڵی دایك و باوك نی یە، ئەو شتێکی ترە، با لێمان تێکەڵ نەبێ...وە ئێمە ناتوانین هەموو بابەتی خولق و سەلیقە بەتەواوی گەمارۆ بدەین و باسی بکەین...سەرەتا با بەم نموونە کورتە دەست پێ دەکەین؛ کەسێك خواردنێکی هەڵگرتووە، کە حەزی لێیەتی ، جا دێتەوە ماڵەوە نایەوێ کەس بەشداری لەگەڵدا بکات وە نایەوێ دایك و باوکی خواردنەکە ببینن لەبەر ئەوە دەیشارێتەوە، یان ئەومتە پێش ئەوەی بێتە ماڵەوە بە خێرایی دەیخوات.

ئایا قەت ئەو ڕەفتارەت ئەنجام داوە!؟

ئەگەر ڕەفتاری وات ئەنجام داوە لەم چیرۆکەی خوارەوە فێربە:

یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەسەرە مەرگدا بوو...براکانی لە دەوروبەری بوون و شایەتی (لا الـه الا اللـه) یان بە گوێ دادەدا بەڵام ئەو زمانی بەسترابوو نەیدەتوانی بیڵێ..ئیدی چوونە لای پێغەمبەرﷺ ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوە...پێغەمبەریش ﷺ لە دایك و باوکی پرسی ئەوانیش گوتیان: دایکی هەیە، ئینجا پێغەمبەرﷺ چووە لای دایکی و لە بارەی کوڕەکەیەوە پرسیاری لێ کرد... دایکەکە پیای هەڵدا و سوپاسی خوای کرد کە کوڕەکەی ملکەچی خوا بووە، شەو نوێژی کردووە، و بە ڕۆژوو بووە، بەڵام پێغەمبەرﷺ دەیویست بزانی لەگەڵ دایکی ڕەفتاری چۆن بووەن، فەرمووی: ( ئەی لەگەڵ تۆ چۆن بوو) یەکسەردایکەکە بێدەنگ بوو، پاشان گوتی: میوەجاتی بۆ خێزانی و منداڵەکانی دەهێنایەوە و لە منی دەشاردەوە.

ئەی خوایە لەبەر ئەم کردەوەیە زمانی بەستراوە و ناتوانێ شایەتمان بێنێ...

پێغەمبەرﷺ ویستی دڵی دایکەکە نەرم بکاتەوە، فەرمانی دا بە هاوەڵانی خۆی کە ئاگرێك داگیرسێنن... هەر نەبێ ئاگری دونیا لە ئاگری دۆزەخ باشترە و ئاسانترە، ناچار دایکە دڵی نەرم بۆوە و

ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە کوڕەکەم خۆش بووم، کوڕەش دەستبەجێ زمانی بۆوە و شایەتمانی هێنا.

ئەم نموونەیە زۆر سادە بوو...بیرکەوە و بزانە لەمەودوا لەگەڵ دایك و باوکت چۆن دەبیت وچی دەکەیت؟

**نەکەی وەکو جورەیج بیت**

وە هەروەها سەلیقە وخوڵقی جوان لە مامەڵەکردنت لەگەڵ دایك و باوکت ئەوەیە کە لەگەڵ یەکەم بانگکردنیان وەڵامیان دەدەیتەوە.

تێبینیەك: دایکت بانگت دەکات ،تۆش سەرقاڵی ئیشی و وەڵامی نادەیتەوە (ئەوە ڕوودەدات، وا نی یە؟!)

پێغەمبەرﷺ بەسەرهاتێکی درێژ بۆ هاوەڵانی دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: پیاوێکی خواپەرست پێشی ئێوە هەبوو ناوی:جورەیجی خواپەرست بوو...زۆر نوێژی دەکرد...لەو کاتەی ئەو لە میحرابدا نوێژی دەکرد دایکی هات و بانگی کرد: جورەیج!: جوریجیش لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەی خوایە: دایکم یان نوێژم، ئیدی نوێژەکەی ئەنجام دا و دایکی چووە دەرەوە، ڕۆژی دواتر دیسان دایکە هاتەوە و بانگی کرد: جورەیج، جورەیج لە دڵی خۆیدا هەمان شتی ووتەوە: خوایە! دایکم و نوێژم، ئیتر بەرەو ڕووی نوێژ بۆوە و دیسان دایکی چووە دەرەوە، بۆجاری سێیەم ئەمە دووپات بۆوە، دایکە لێی تووڕەبوو

گوتی: خوایە نەمریٚ هەتا سەیری ڕووی (.....) نەکات!! قسەیەکی کرد بە واتای: دەك خوایە تووشی ئافرەتی داوێن پیس بێت.

پاشی ماوەیەك ئافرەتێکی داوێن پیسی تووش بوو، جا ئەو ئافرەتە سکی پڕ بوو پاشان کوڕێکی بوو و ئینجا گوتی: ئەوە لە جورەیجە (بە درۆ و بوختان) ئیترچەند گەنجێك بۆی هەڵسان لیٚ بدەن و میحرابکەی لیٚ بڕووخێنن...پاشان پەشیمان بۆوە و تەوبەی کرد و خواش ڕزگاری کرد.

دەبا ئەم فەرموودەیە بگاتە هەموو کەسێك...خۆ ڕەفتارێکی زۆر ئاسانە: هەر کە دایکت بانگی کردی یەکسەر وەڵامی بدەوە، ئەو چاوەڕیٚ ی وەڵامی تۆیە...

ئەم چیرۆکە پێشکەشە بە گەنجێك کە دەچێتە مزگەوت بۆ نوێژی هەینی و دایك و باوکی چاوەڕێی دەکەن کاتژمێرێك...دووان...هەر نایەتەوە هەتا هەموو خێزان بۆ نانی نیوەڕۆ کۆدەبنەوە.

هەروەها ئەم چیرۆکە پێشکەشە بە کچێك کە بە درێژایی کاتدا لەگەڵ هاوڕێکانی دادەنیشێت ، بۆ نیو کاتژمێر بەخیلی دەکات لەگەڵ دایکی دابنیشێت...

جورەیج لەگەڵ ئەوەی خواپەرست بوو ئاوای بەسەر هات چونکە گویٚ نەدا بانگکردنی دایکی و بەرەو پیری ئەو نەچوو...ئەی تۆ ئەی گەنجەکە...ئەی کچەکە...ئێوە حاڵتان چۆنە؟!

ئێستا ڕات چی یە لە خوڵق و سەلیقەی ئیسلام سەبارەت بە مامەڵە کردن لەگەڵ دایکدا؟

ئەمە مشتێکە لە خەرمانەیەك.

## ئەوە چ ئایینێکە

سەیری ئەو هەستە جوان و بەرزە بکە بە ڕوخسەت خواستنی چوونە ژوورەوەی ژووری نووستنی دایك و باوك، کە ئایاتی قورئانی پیرۆزیش نیشانە و بەڵگەی بۆ هێناوەتەوە.

ئەو قورئانەی کە تا ڕۆژی دوایی ئەم ڕەوشتەی بۆمان هێشتۆتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ مِن قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ الظَّهِيرَةِ وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاء ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَّكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ طَوَّافُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[1].

واتە:(ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە با بەندەو ئەو منداڵانەتان (کە هێشتا نەگەیشتۆتە تەمەنی هەرزەکاری) لە سێ کاتدا (فێری ئەوە بکرێن) مۆڵەت بخوازن (لە سەردانی ژوورە نووستنی ژن و مێردا)

---

[1] سورة النور،٥٨.

پـێش نوێـژی بـەیانی، کـاتی نیـوەڕۆ کـە پۆشـاکتان دادەنێن،لـە دوای نوێژی عیشا، سێ کاتە کە لەوانەیە عەورەتی ئێوەی تێدا دەربکەوێت (با کەسی تر نەتانبینێت)، لە دوای ئەو سێ کاتە قەیناکە بۆ ئێـوەش و ئـەوانیش، کـە بگـەڕێن بەناویەکـدا و بـچن بـۆ لای یـەکتر، ئـا بـەو شـێوەیە خـوا ئایەتـەکانی خۆیتـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە، (تـا تووشـی کێشەی دەروونی نەبن) خواش هەمیشە زاناو دانایە) [١].

پاکی و بێگەردی بۆ خوا... ئایەتێك بنەمایەك لـە بنـەماکانی مۆڵەت خواستن بـۆ ژووری نووسـتن دادەمـەزرێنێت و دەیـچەسپێنێت ئیتر لەمەودوا چۆن دەڵێی: ئیسلام تەنها لـەناو مزگەوتـە...ئـەوەتا وا لە ژووری نووستن بەرنامەی داناوە.

سەیری پلە و پایەی خووی ڕەفتارکردن لـەو ئایینـە مەزنـەدا بکە...بزانە تا چ سنوورێك ڕۆیشتووە.

وەرچەرخانێکـی مـەزن (نقلة عظيمة)

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ گوتی: ئـەی نێـردراوی خـودا گـەر ویـستم بـچمە ژووری نووسـتنی دایکـم ڕووخـسەت بخـوازم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، پیاوەکە گوتی: ئەی نێـردراوی خـودا بـۆ چـوونە ژوورەوەی ژووری نووسـتنی دایکـم ڕووخـسەت بخـوازم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بـەڵێ، پیاوەکـە بـۆ جـاری سـێ یـەم هـەمان

---

[٢] تەفسیری ئاسان.

پرسیاری کردەوە وگوتی: ئەی نێردراوی خودا گەر ویستم بچمە ژووری نووستنی دایکم ڕووخسەت بخوازم؟ پێغەمبەرﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: (ئەی تۆ حەز دەکەی دایکت بە ڕووتی ببینی؟!) ئەویش گوتی: نەخێر ئەی نێردراوی خودا، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: دە ڕوخسەت بخوازە.

عەرەبەکان هەر لە کۆنەوە نەریتیان وابوو لە کاتی چوونە ژوورەوەدا ڕوخسەت لە هەموو کەس بخوازن تەنها بۆ چوونە ژوورەوەی ژووری دایك نەبێ...

بەر لە ئیسلام نەك هەر عەرەب بەڵکو تەواوی جیهان ئەم جۆرە ڕەوشتەیان پێ شتێکی ئەوتۆ نەبووە و گرنگییان پێ نەداوە...

کە پێغەمبەرﷺ هات ، ئایینی ئیسلامی هێنا و مرۆڤایەتی دەرباز کرد و بازدانێك وگۆڕانێکی گەورەی دروست کرد لە نەزانی یەوە بۆ سیستەم وە لە گوێ نەدان بە هەست و سۆزەوە بۆ ڕەوشتی بەرز و شارستانیەت.

ئینجا نەوەکانی ئیسلام هاتنە سەر دونیا و ڕەوشت و ڕەفتاری ئیسلامیان بە هەموو جیهان ناساند... ئێستاش هەر هەموو خەڵکی ئەم سەر زەمینە بۆ چوونە ژوورەوەی ژووری نووستنی دایك و باوك ڕووخسەت دەخوازێ... هەموو دونیا ئێستا وا بە ڕەوشتی ئیسلام هەڵسوکەوت دەکات ئینجا ڕۆژئاوایییەکانیش شارستانیەت بۆ خۆیان دەگەڕێننەوە.

## خووى مامەڵەكردن لەگەڵ خێزان

پاش باسكردنی سەلیقە و خووی مامەڵەكردن لەگەڵ دایك وباوك دەچینە سەر باسێكی تر كە ئەویش سەلیقەی مامەڵەكردنە لەگەڵ خێزان...یەكەم شت كە لە فیلم و زنجیرە بیانی یەكاندا دەیبینین ڕۆمانسیەت و دەربڕینی هەست و سۆزێكی نەرم وجوان لە نێوان دوو هاوسەردا...سەیر دەكەی پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێك لە چێشتخانەیەكدا دانیشتوون (جا هاوسەرییەتی یان هەركێ بێت وەكو یەكە) ئیتر پارچەیەك گۆشت بە چەقۆ دەبڕێت و بە چەتاڵ دەیخاتە دەمی خێزانەكەی یان هاوڕێ كچەكەی... هەتا گەنجانمان و كچەكانمان حەزیان دەچێتە ئەم ڕەفتارە بەرزە و دەڵێن: ((ئاه، ئەمەیە زەوق، ئەمەیە شارستانیەت...خۆزیا ئێمەش فێربووینایە)) ئینجا چەندەها نەوە سەر هەڵدەدات و لاسایی ئەم دیمەنە دەكاتەوە، خۆ لاسایی یەكی خراپ نی یە...بەلام ئەگەر گومانی ئەوەت برد كە ئەم ڕەوشتە لە بناغەوە هی ئەوانە ئەوا تۆ هەڵەی!!

پێغەمبەرﷺ ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر باسی ئەوەی كردووە لەم فەرموودەیەی خوارەوە:

، (گەورەترین خێرو چاكە پاروو نانێكە كە پیاو دەیخاتە دەمی خێزانەكەی).

دەی كێ لە كێ فێر بووە؟ كێ لە كێ ی وەرگرتووە!؟

## ئەلعەوالی و سەلیقەی بەرز

لەم ڕۆژگارەدا چەندەها پەیوەندی ژن و پیاو پاش مارەکردن تێکدەچێ و مارەکردنەکەش هەڵدەوەشێتەوە جا بە هەر هۆیەك بێت ج بە هۆی ماڵدانان یان دامەزراندنی خانوو بێت...یان بەهۆی شتوومەك و کەلوپەلی ناو ماڵ بێ..یان لەسەر زێڕو... هتد...ئیتر پیاوەکەش ناتوانێت هەمان ئاستی ژیان و ئەو خۆشگوزەرانیە بۆ کچەکە تەرخان بکات کە پێشترلە ماڵی باوکی هەیبوو...یان کەس و کاری بووك لە داواکاریەکانیان زیادەڕۆیی دەکەن...دەرئەنجامی ئەمانەش هاوسەرێتی یەکە هەڵدەوەشێتەوەو تێکەچێ... لێرەدا ئیسلام گرنگی دەدات بە بارو ئاستی کۆمەلایەتی نێوان ژن و پیاو وە چارەسەرێکی باشی ئەم کێشانەی کردووە و پرۆگرامی جوان و ڕێکو پێکی بۆ داناوە.

ناسراوە کە پێغەمبەر ﷺ هەموو خێزانەکانی خۆی لە تەنیشت مزگەوتی نەبەوی شەریف نیشتەجێ کردبوو، وە ئەم شوێنە گشتی بیابانە و خێزانەکانیشی خەڵکی بیابانن و لەم جۆرە ژیانە ڕاهاتوون، بەلام کە پێغەمبەرﷺ ماریەی میسری مارەکرد ئەوە حاڵەتێکی تر بوو؛ خاتوو ماریە لە میسر هاتبوو، میسریش بە ڕووباری نیل و سەوزایی کەناری نیل بەناوبانگە ، ئایا ماریە دەتوانێت لەم ناوچە بیابانە بژیت!؟ ئەی باشە لێرە پێغەمبەرﷺ

چی کرد؟ ئایا هەر لە تەنیشت خێزانەکانی نیشتەجێی کرد و ماڵی بۆ دانا؟...

ناوچەیەك هەبوو لە مەدینە کە پێ ی دەگوترا (العوالی) ،پێغەمبەرﷺ هەڵسا لەو ناوچەیە ماریەی نیشتەجێ کرد وماڵی بۆ دانا...بۆچی؟ چونکە ناوچەی(العوالی) هەمووی سەوزایی و وە شوێنی کشتوکاڵ بوو.

پێغەمبەرﷺ میسر دەناسێ جا ڕەچاوی باری ژیانی ئەو ژنەی میسرییەی کرد.

ئەوەیە مامەڵەی دروست لەگەڵ هاوسەردا !!

کاتێك پێغەمبەرﷺ ویستی کچە خۆشەویستەکەی خاتوو فاطمە بەشوویدات، پیاوێك هاتە داوای کە نموونەی کەمە...پیاو، ئیماندار، متمانە پێکراو کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو باشە عەلی، چیت هەبوو بۆ ئەوەی ژن بێنی؟

عەلی هیچی نەبوو تەنها حەسیرێك و سەرینێك نەبێ کە ناواخنەکەی لێف بوو.

خۆ نەمانگوتووە وەکو ئەو بکە...تکایە ڕواڵەتی قسەکان وەرمەگرە...لێرەدا مەبەستم زیادەڕەوی نی یە... هاوسەرداریتی ئێستا وا خەریکە هەرەس دێنێ و تێك دەچێ بە هۆی ناکۆکی نێوان

هەردوو خێزانی بووك و زاوا تەنها لەبەر ڕەنگی جلی بووکێنی سپی بێت یان شەکەری!!!

دیسان دەڵێینەوە دەبێ ئاست و باری کۆمەڵایەتی نێوان ژن و پیاو ڕەچاو بکرێت وە دەبێ لەیەك نزیك بن کە ئەوەش لە ڕەوشت و ڕەفتاری ئیسلامدایە...

## ئیسلامە شیرین و جوانەکەمان

هێشتا هەرلەناو بازنەی خێزانداین...دەزانین کە باری دەروونی ئافرەت لە کاتی بێ نوێژیدا ناهەموار و شپرزە دەبێت...!!
جا لەو ماوەیەدا زۆربەی پیاوان بە هیچ شێوەیەك حەز ناکەن مامەڵەی شیرین لەگەڵ خێزانەکانیان بکەن...بەڵکو دەگاتە ئاستێك کە نایانەوێ سەیری دەم و چاویشیان بکەن کە ئەوەش سەلیقەیەکی نزمە لە مامەڵکردنیاندا.

سەیری پێغەمبەرﷺی خۆشەویستمان بکە و بزانە ڕەفتاری لەگەڵ هاوسەرەکەی چۆن بووە ؟

خاتوو عائشە دەڵێ: (من لە کاتی بێ نوێژیدا لە قاپێك ئاوم دەخواردەوە و پێغەمبەرﷺیش سەیری لێوەکانمی دەکرد بە دەم قاپەکەوە و یەکسەر لێی وەردەگرتم و لەجێی شوێنی دەمم ئاوەکەی دەخواردەوە).

ئەوە ئیسلامە، ئەوە پێغەمبەری خوایە (محمد)... ئەوەیە مامەڵە و ڕەفتاری لەگەڵ خێزانی کە بە زمانی خۆی بە عائشە دەفەرموێ ﷺ: (من لە تۆ دڵتەنگ نیم)، باشە لەبەر چی لەو کاتە پێغەمبەر ﷺ ئەم جۆرە کار و کردەوەیە ئەنجام دەدات...!؟ لەبەرئەوەی ئافرەت لە کاتی بێ نوێژیدا پێویستی بەم مامەڵە نەرم و ناسکە هەیە...تێبگە برای خۆشەویست...تۆش دەتوانی پەیڕەوی ئەو بکەی و ڕێبازی ئەو بگری و لەو فێربیت...

ئایا ئەم جۆرە ڕەوشتە لای ڕۆژئاواییەکان بەدی دەکرێت!!؟ بەڕاستی دەبێ گازی پەشیمانی لە پەنجەکانمان بدەین بەهۆی تێنەگەیشتنمان و بەهۆی کەم تەرخەمیمان لە تەواو شارەزانەبوونی ئایینمان...بەڕاستی ئیسلامەکەمان جوانە.

## مامەڵەیەکی بەرز سەرەڕای کردەوەی ناشیرین...!!

وە هەروەها لە خوڵق و سەلیقەی دروست لە مامەڵەکردن لەگەڵ خێزاندا چاودێریکردن و ڕەچاوکردنی هەست و سۆزی ئافرەتە لە کاتی لاواز بوون و وە لەکاتی تووڕەبوونیدا.

ئەم هەڵوێستەی خوارەوە بخوێنەوەو لێی فێربە:

ڕۆژێك خاتوو عائشە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەیەکەوە دانیشتن و یەکسەر دەنگی بەرزکردەوە سەر دەنگی پێغەمبەر ﷺ، ئەبوبەکری باوکی عائشە کە ئەو دیمەنەی بینی خۆی نەگرت و

ئـارامی نــەما ویـستی لێـی بـدات، پێغەمبـەریش ﷺ یەکـسەر هاتـە نێوانیـان و هـەردووکیانی هێمن کـردەوە ئـیتر بـاوکی عائـشە دەسـتی گەڕانـدەوە ڕۆیـشت ولـێ ی نـەدا...خـاتوو عائـشە لـەم هەڵوێـستەدا هەسـتی بـە ڕیـسوایی و سـووکایەتی کـرد، چونکە خـەریك بـوو لێـی بدرێ!!

ئـەم هەسـتە بەسـەر هـەموو ئافرەتێکـا دێـت جـا لـە هـەمان هەڵوێست بێت یان لە هەر هەڵوێـستێکی تـری لـە یـەك چووی وەکو ئەو بێت...

پێغەمبــەر ﷺ هەڵوێــستەکەی لەســەر عائــشە ئاســان کــرد ونەرمی کردەوە وفەرمووی ﷺ: (ببینیـت چۆن کێشەی نێوان تـۆ و باوکتم چارەسەرکرد).

ئەم گفتە جوانــە لـەم هەڵوێـستەدا نیـشانە و بەڵگـەی دڵێکـی گەورەیـە ، دڵێـك کـە بـە هانـای هـەموو خەڵکـەوە دێـت و هـەمووانی خۆش دەوێت...ڕەوشتێکی پڕ هەستە کە دڵ ئەسیر دەکات. بەڵێ دڵـی خێزانەکەت ئەسیر دەکات، بەڵام:

نە ئەوەندە ڕەق بە بشکێنرێی ، وە نە ئەوەندە نەرم بە بگوشرێی.

## من بۆ تۆ وەکو باوکی زەرعم بۆ دایکی زەرع

هەنـدێك پیـاو هـەن چـەندجار هەرەشـەو گوڕەشـە لـە ژنـی خۆیـان دەکـەن جـا بـە گاڵتـە بێـت یـان بـە ڕاسـتی، دەڵـێ : ژنـت

بەسەردێنم...هەندێك پیاویش ئەم قسانە دەخەنە قاڵبی گاڵتەبازی و هەست بەوە ناکەن کە ئەو شتانە زۆر بە قووڵی ئافرەت بریندار دەکات و ئازاری دەدات و هەرگیز لە بیری ناچێتەوە...دواتر بەبیری دێتەوە و دەڵێی؛ ها ئەوە بە بیرم هاتەوە بە خوا پێش دە ساڵ بە گاڵتە ئەم قسەیەم کردووە خۆ ئەو ژنە هەر لە بیریەتی...!!

پاکی و بێگەردی بۆ خوا !! کوا سەلیقەی مامەڵە و ڕەفتارکردنت لەگەڵ ئافرەت؟...

برای بەڕێز لەم گفتوگۆیە درێژەی نێوان پێغەمبەرﷺ و خاتوو عائشە فێربە:

ڕۆژێك خاتوو عائشە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دانیشتبوو چیرۆك بەسەرهاتی ١٠ ژن ومێردی بۆ خۆشەویستﷺ گێڕایەوە، بەردەوام بوو لە گێڕانەوەی چیرۆکەکان بە درێژی تا گەیشتە دوا چیرۆك ، گوتی؛ وە دوا پیاو ناوی باوکی زەرع بوو کە لەگەڵ ژنەکەی زۆر نەرم ونیان بوو، یەکتریان زۆر خۆشدەویست، خۆشترین ژیانی لەگەڵ بردەسەر پاشان خاتوو عائشە گوتی؛ کەچی تەلاقی دا...پێغەمبەرﷺ یەکسەر سەیری خاتوو عائشەی کرد و فەرمووی؛ (من بۆ تۆ وەکو باوکی زەرعەم بۆ دایکی زەرع بەڵام من هەرگیز تەلاقت نادەم).

لێرەدا پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەیەوێ دڵنەوایی خێزانەکەی بکات و هێمنی و ئارامی بخاتە دڵیەوە...

که ئافرەت ڕووداوەکانی تەلاقدان بۆ پیاوەکەی دەگێڕێتەوە لەبەرئەوەیە چونکە ئەو دەترسێ کە وەکو ئەوانی بەسەر بێت...

بەڵام سەیری هەستیاری دڵ و دەروونی پێغەمبەر ﷺ بکە و سەیری ئەو هەستە بەرزەی بکە کە لەگەڵ بەرامبەرەکەی دەدوێ چۆن ووتەکانی وەردەگرێ و بە یەك قسەی نەرم دڵی ڕادەگرێ و ئارامی دەکات، (من بۆ تۆ وەکو باوکی زەرعم بۆ دایکی زەرع بەڵام من تەلاقت نادەم).

توخوا لە کوێ و لە کێ فێری سەلیقەی ڕەفتارکردن دەبین...!

## ڕووخۆش و بەپێکەنین

ئەم نموونەیەی خوارەوە سەلیقەیەکی نزمە لە مامەڵەکردندا...!!

سەیردەکەی پیاوەکە ماندووە و لە ئیش گەڕاوەتەوە ئەوە سەرەڕای تەپ و تۆز و ئارەقەی ڕێگا و بان و ناخۆشییەکانی ناو ئۆتۆمبیلی هاتووچۆ...ئیتر...هەر کە هاتە ماڵەوە و تۆتکە ناگرێ یەکسەر لە شوێنێك دادەنیشێ و ڕۆژنامەیەك دەگرێتە دەست و هیچ قسەیەکیش ناکا...پاش ئەمەش دەخەوێ...لە ئاکامدا ژنە گیرۆدە و گرفتار دەبێت بە دەست ئەم کردەوە ناهەموارە...

هەموو پیاوێكیش ئەوهانین... بەڵام بەو كەسە دەڵێم كە ئەم كارە ئەنجام دەدات: ئایا تۆ لە پێغەمبەر پڕئیشتر و سەرقاڵتری...!؟

خێزانەكانی پێغەمبەرﷺ دەڵێن:

پێغەمبـــەرﷺ لەگـــەڵمان دادەنیـــشت ،گفتوگـــۆی لەگـــەڵ دەكـردین و دەیدوانـدین وپێدەكـەنی و بـە پێكەنینیـشی دەهێنـاین و كاتێكیش كە بانگی نوێژ دەدرا دەتگوت هەر نامانناسێ و نایناسین.

ئــەوە دووبــارە بخوێنــەوە: ئــەو پێدەكــەنی و بــە پێكــەنینی دەهێنـاین...ئەوەیـە زەوقـی رەفتـاركردن لـە ئیـسلامدا...ئـەو قـسەی لەگـەڵ خێزانـەكانی دەكـرد و ئـەوانیش قـسەیان لەگـەڵ دەكـرد و هەرگیز نەیدەگوت:(دە لێم گەڕێن خۆ بە درێژایی ڕۆژەكە گەڕاوم و ماندووبوومە)...

بەڵێ چـەندەها مـاڵ ،چـەندەها خێـز دەڕووخـێ و تێكدەچـێ بەهۆی نەبوونی سەلیقەی ئیسلامی لەمامەڵەكردندا.

**لە زانای نوممەت فێربە كە خۆت**

**جوان بكەی و خۆت برازێنیتەوە**

هــــەموو پیاوێـــك حـــەز دەكـــات ژنەكـــەی خـــۆی بـــۆ برازێنێتــەوە...ئــەو هــەردەم دەیــەوێت ژنەكـەی شـاجوانی جیهـان بێــت...هەمیــشە لەســەر كــاملترین و شــاوترین شــێوە و ڕوخــسار بیبینێت، دەیەوێت ژنەكەی وا بێت و وا بێت و...و

بەلام مەحاڵە ئەو خۆی بۆ ژنەکەی برازێنێتەوە...ئەو بەلایەوە گرنگ نی یە پارێزگاری ڕواڵەت و ڕووخساری دەرەکی خۆی بکات بەگشتی.

کاتێك پێغەمبەرﷺ دوعا و نزای بۆ (عبداللە کوری عەباس) کرد فەرمووی: (خوایە زانا و داناو زیرەکی بکەیت)، ئینجا بەو نزایە عبداللە بووە زاناترین هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ، ئیدی هاوەڵانی تر زانست و زانیاریان لەو وەردەگرت. عەبداللە گوتی: (پێم خۆشە خۆم بۆ ژنەکەم برازێنمەوە هەروەك چۆن پێم خۆشە کە ئەو خۆی بۆ من برازێنێتەوە).

بەخوا ئەوانە چەند ووشەیەکی بەهێز و کاریگەرن بۆ هەستە ناسکەکان، سەلیقەیەکی پڕ لە شارستانیەت و شکۆمەندی یە، ئەوجا تێبگە!

(وَ قَدموُا لِأنفُسِكُم)

**بۆ خۆتان دەست پێشخەری بکەن**

سەلیقەی مامەڵەکردن لە ئیسلامدا هەموو سنوورێکی بڕیوە و لە دەرگای ووردترین خاڵ دەدات تاکو گەورەترین مەسەلە...!! هەتا گەیشتۆتە تێکەڵ بوون و هاورێیەتی ژن و مێرد لەسەرجێگا و دۆشەك و سەرینی هاوسەرێتی ، خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُمْ﴾[1]

واتــه: (ژنـانی هاوسـه‌رتان کێڵگـه‌ن بۆتـان و شـوێنی چـاندنی وه‌چـه‌ن، جـا به‌هـه‌ر شـێوه‌یه‌ك ده‌تانـه‌وێت تـۆو بوه‌شـێننه نـاو کێڵگه‌کانتانـه‌وه (بـه هیـوای به‌رهـه‌م) و بـۆ خۆتـان ده‌ستپێـشخه‌ری بکه‌ن).

لێه‌دا مانای چی یه: وه بۆ خۆتان ده‌ستپێشخه‌ری بکه‌ن؟ ﴿وَقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُمْ﴾:

واتای ئه‌م ئایه‌تـه لـه‌م فه‌رمووده‌یـه‌ی پێغه‌مبـه‌رﷺ وه‌رگـره که ده‌فه‌رموێ:

((لا يَقَعَ أَحَدَكُمْ عَلَى زَوجَتِه كَما تَقَعَ بَهيمة عَلَى بَهِيمَةٍ، ولكن يبدا بالملاطفه والملاعَبه))

واته (که‌س نه‌که‌وێتـه سـه‌ر خێزانه‌که‌ی وه‌ك چۆن وڵاخێك یـان ئاژه‌ڵێـك ده‌که‌وێتـه سـه‌ر ئاژه‌ڵێـك ، بـا بـه نـاز ڕاگرتنـی و گاڵتـه وگه‌پ و ده‌ستبازی ده‌ست پێ بکات).

بزانه ئه‌م ئایینه له هیچی که‌م نی یه ته‌نها چه‌ند که‌سانێك نه‌بێ که نوێنه‌رایه‌تی بکه‌ن و بیبزوێنن...جا که ئـه‌و که‌سـانه په‌یـدا بوون و که‌وتنه جم وجووڵ ئا له‌و کاته‌دا ئـه‌من و ئاسایش و ئاشتی

(1) سورة البقرة:٢٢٣.

و تەبایی و پاکی و خۆشەویستی و شارستانیەت و پێشکەوتن دێتەدی و دەیبینی.

**ئەوە چ زەوقێکە... !!**

یەکێك لەو سەلیقانەی کە پێغەمبەرﷺ فێری کردووین ئەوەیە کە نابێ بێیتەوە ناو ماڵی خۆت تاوەکو زەنگی دەرگا لێ نەدەیت هەرچەندە کلیلیشت پێ یە.

دەبێ چەند ساتێك چاوەڕێ بکەیت تا دەرگا دەکرێتەوە ئینجا دەچیتە ژوورەوە!!

ئەم نموونەیەش نە لە ڕادەبەدەرە نە زیادەڕەوییە.

بەڵکو زۆر سادەیە بەڵام تۆ ڕانەهاتووی...باشە حیکمەت لەم کردەوەیە چی یە؟

یەکەمیان: دەرفەت دەدەیتە خێزانەکەت بۆ ئەوەی خۆی بۆت ئامادە بکات...دووەم تۆ بەو خۆ ئامادەکردنەی ئەو دڵخۆش و شادمان دەبیت...هەروەها ئەوەش هاندەرێکە بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرموودەیە:

((إِذَا نَظَرَ إِلَيْهَا سَرَّتْهُ)) [1]

واتە: ((کاتێك کە تەماشای ژنەکەی دەکات دڵی پێخۆش دەبێت))

---

[1] رواه ابوداود، باب ٣٢، حديث (١٦٦٧).

بیرێك لەوە بكەوە ئەگەر تۆ دەرفەت نەدەیتە ژنەكەت بۆ خۆ جوان كردن و بۆن خۆش كردنی پێش هاتنە ژوورەوەت بۆ ماڵ ئەو كات لە جیاتی دڵخۆشت كات دەتكوژێ.

دووەمیان: چونكە هەندێك لە پیاو هەر بە تەبیعەت ناپاكن و خیانەت لە ژنەكانیان دەكەن، پێغەمبەریش ﷺ دەیەوێت ئەو نەخۆشی یە لە دڵی ئەم جۆرە پیاوانە دەربكات...هەرگیز نابێ پیاو ئاوا لەگەڵ ژنی خۆی مامەڵە بكات، دەبێت هەمیشە ڕاستگۆیی و دڵنیایی و ئارامی پێ ببەخشێ.

ڕاستە...خۆشەویستی بچینە خۆشەویستی دەدووریتەوە.

دەی با فێری ڕۆیشتن بین!!

ئێستا ماڵەكەت بەوەی تیایەتی جێی دێڵی ڕووە و شەقام هەنگاو دەنێی...كە سەرنج دەدەینە شەقامەكان ، گەندەڵی و وێرانكارییە...جا ئێمە وا پەروەردەكراوین كە نابێ لە ڕۆیشتنا بە لاكەلا بین...پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتنێكی خێرا دەڕۆیشت بە بێ ڕاكردن كە ئەوە ڕۆیشتنێكی دروستە و بە سەنگە.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَاماً﴾ (1) .

(1) سورة الفرقان:٦٣.

واته:(بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بە هێمنی بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان بە قسە و قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو (ڕەوشت بەرزی خۆیان دەنوێنن ئاژاوە و شەڕ نانێنەوە).

ئایا تۆ لەسەر چ شێوازێکی ڕۆیشتن ڕاهاتووی؟

پاکی و بێگەردی بۆ خوا ڕۆیشتنی خەڵك چەند سەیرە و سەرسورهێنەرە!!

﴿أکثرهم لایعقلون﴾

(زۆربەیان ژیر و دانا نابن)

لە ڕەوشتە کۆمەڵایەتییە نادروستەکان لە شەقام و شۆستەکاندا ئەو دەنگە ناهەموار و بێزارکەرانەیە کە لە ئامێری ووریاکەرەوەی ئۆتۆمبیلەکانەوە دەردەچێت ، جا کاکی شوفێریش لە گەورەوە تا بچووك شانازی بەم بەزمەوە دەکەن ، سەیری دەکەی لە خوارەوە یان لە دەرەوەی ماڵەکە وەستاوە، پشوویێك وەردەگرێت و خۆی ماندوو ناکات بێتە خوارەوە دەرگا لێبات یان سەرکەوێ بەڵکو لەجیاتی ئەمە دەست لەسەر ئامێری هۆرن دادەنێت هۆرنێك...دووان...سێیان...

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ - وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْراً لَّهُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1]

واتە: (بەڕاستی ئەوانەی لە دەرەوەی ژوورەكان بانگت دەكەن، ئەوانە زۆربەیان نەفامن و ژیرنابن (چونكە ڕەوشتی كۆمەڵایەتی دروستیان لەو بوارەدا ڕەچاو نەكردووە). خۆ ئەگەر خۆگر نەبوونایە تا دەچووینە دەرەوە بۆ لایان، ئەوا چاكتر و ڕەواتر بوو بۆیان خوا لێخۆشبوو میهرەبانە). ڕاستە ئەو ئایەتە باسی پێغەمبەر ﷺ دەكات بەڵام ڕەفتار و ڕەوشتی كۆمەڵایەتی خەڵكیش پوختە و ڕێك دەكات.

یەك لە مافەكانی خەڵك لەسەر تۆ ئەوەیە كە بێزاریان نەكەیت...ئاخر تۆ لەبەر دەرگا هۆڕن لێ ئەدەیت خەڵكانێك لەوانەیە خەوتبن...هەیە قوتابی یە دەخوێنێت ...هەیە نەخۆشە...هەشە نوێژ دەكات...ئەوەش بزانە كە شەقام تەنها موڵكی تۆ نی یە.

﴿فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ﴾[2]

(ڕێ بدەن بە كەسانی تر خوا ڕێتان پێ دەدا)

هەروەها لە ڕەفتارە سەیرەكان...ڕەفتاری كاكی شوفێرە كە ڕێگا بە ئۆتۆمبیلی دواوەی نادات پێشی بكەوێت...ئەگەر لێت پرسی

(1) سورة الحجرات:4-5.

(2) سورة المجادلة:11.

بۆ وا دەكەی لە وەلآمدا هیچ هۆیەكی نی یە، سەیرتر لەمە ئەوەیە كە ئەم ڕەوشتە بۆتە خووێكی هەست پێ نەكراو كە ڕاهاتووە لەسەری و وە بە بەردەوامیش ئەنجامی دەدات...بەلاَم ئیسلام دێت چارەسەری ئەم هەڵوێستە دەكات بەم ئایەتەی خوارەوە :

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ﴾[1].

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە كاتێك لە دانیشتن و كۆبوونەوەكاندا پێیان دەووترێت: ڕێ بدەن بە كەسانی تر و ئەلقەی دانیشتنەكە فراوان بكەن، ئەوە ئێوە فراوانی بكەن، ئەگەر ئێوە واتان كرد، خوا پاداشتی فراوانتان پێ دەبەخشێت).

ووشەی (فافسحوا) واتە ڕێگا بدەن و جێگا فراوان بكەن نەك تەنها لەئەلقەی دانیشتنەكان بەڵكو لە ڕێگا و بانیش، (ڕێگا بدەن فراوانی كەن خوا ڕێگاتان پێ دەدات و بۆتان فراوان دەكات)...ئەگەر ڕێگات لە خەڵك تەنگ و تەسك كردەوە كەواتە تۆ زەوق وسەلیقەیەكی جوان ودروستت نی یە، عومەری كوڕی خەتاب دەفەرموێ:(ثلاثة يصفين لك ود أخيك)واتە: (سێ شت خۆشەویستی و ئاشنایی براكەت بۆت دەپاڵێوی و سان دەكاتەوە... دەفەرموێ

[1] سورة المجادلة:١١.

یەكێك لەمانە ئەوەیە : كە لە دانیشتنەكان ڕێگا و جێگای بۆ بكەیتەوە).

ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ لە مزگەوتا دانیشتبوو ئەعرابیەك هاتە ژوورەوە پێغەمبەرﷺ یەكسەر خۆی بۆ خزاند (واتە : هەڵسا وشوێن خۆی دا بەو لەگەڵ ئەوەی كە مزگەوتەكە پڕ لە خەڵك نەبوو) پاشان ئەعرابیەكە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لە جێگای خۆت هەڵسای؟ خۆ جێگا زۆر ماوە لە مزگەوتەكە ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:

((حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ إذا جاء اخُوهُ ان يتزحزح له))

واتە: (هەموو موسوڵمانێك ئەو مافەی لەسەرە كە ئەگەر براكەی هاتە ژوورەوە خۆی بۆ بخزێنێ هەڵسێ وجێگای كاتەوە).

دەی ئێستا زەوقی هەڵسووكەوتكردن و ڕەوشتە كۆمەڵایەتیەكانت لەكوێ وەرگرتووە لە كێ فێر بوویتە...؟ لە شارستانیەتی ڕۆژئاواییەكان...!؟

باشترین نموونە بۆ جێبەجێ كردنی ئەم فەرموودەیە جێگاكردنەوەی براكەتە لە شوێنی پرسە وسەرەخۆشیەكاندا...بزانە لەم ڕۆژگارەدا چی ڕوودەدات...لە كۆبوونەوەی پرسەدا كەسێك وا دێتە ژوورەوە، ئەو خەڵكەی كە دانیشتووە هەر هەمووی چاوی بڕیوەتە سەر ئەو قوڕ بەسەرەی وا دێت...هەر خوا

پشتیوانی بێت کە لە دڵی خۆیدا دەڵێت: (زەوییەکە شەق بەو قووتم بدە)...ئەی ئەگەر لەو کاتەدا پیاوێك لە شوێن خۆی هەڵسێ و دەستی ئەو کەسە بگرێ و لە جێگایەك داینیشێنێ...

لەناو بازنەی ئیسلامدا، زەوق و سەلیقەی دروست لە مامەڵەکردندا ئەلقەی ڕزگار بوونە بۆ زۆربەی خنکاوەکان لە ڕووباری ژیان...ئەم ئایەتەی پێشوو هەموو شوێنێك دەگرێتەوە: لە شەقام شۆستەکاندا (بۆ پیادە و شوفێرەکان)، لە شوێنی دانیشتنەکان ، لە جەنازەو پرسەکاندا...تەنانەت لە پایە و پلیکانەی زانکۆکانیش جێ بەجێ دەکرێ؟!

## لابردنی زەرەر و زیانەکان لە ڕێگاوباندا

## لای خوا بە چاکە بۆت دەنوسرێ

ئایا فڕێدانی زبڵ لەسەر شەقامەکاندا سەلیقەیەکی دروستەو بەجێ یە...؟ سەیردەکەی ئەو کەسە دێتە دەرەوە و سەیری ئەو لا و ئەو لا دەکات و لە دڵی خۆی دەڵێ: خوایە کەس نەمبینێ؟ جا سەیری لای ڕاست و چەپ دەکات هەردەڵێی شتێکی دزیوە یەکسەر زبڵەکە فڕێ دەدات...

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (لابردنی زەرەر و زیانەکان لە ڕێگاوباندا لای خوا بەچاکە بۆت دەنووسرێ) ئێمەش دێین بەپێچەوانەی ئەم فەرموودەیە زەرەر و زیانەکان لە ڕێگا ولەسەر

شەقام وشۆستەكاندا فڕێ دەدەین...!! پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((بڕواهێنان (ئیمان) شەست و هەندێك لقە بەرزترینیان ووتنی (لا اله الا الله) یە و نزمترینیان لابردنی زەرەر و زیانە لە ڕێگاوباندا)).

مانای ئەوەیە لابردنی زەرەر و زیان بەشێكە لە بڕوا هێنان.

ئەوەش بەڵگەیە كە سەلیقەی بەرز لە مامەڵەكردن لە ئیمانەوە دێت...كەوابێ زەوقی ڕەفتاركردن ڕەوشتێكە لە ئیسلامەوە هەڵقووڵاوە... ئەی پێشتر نەمانگوت بنچینەی ئەم ڕەوشتە لە ئیسلامدایە...؟ كەواتە دەبێ باش شارەزای ئیسلام بین و بە تەواوی لێی تێبگەین.

١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر پێغەمبەرﷺ فێری ئەم جۆرە ڕەوشتەی كردین و ئێستاش وا لە چەرخی بیست و یەكداین و هەمیشە ئاراستەمان دەكات.

باشە، ئەگەر لە ڕێگایەكی بیابان بووین و زبڵمان فڕێدا، ئایا هەست بە ئازاری ویژدان دەكەی كە هەرچەندە شوێنەكە بیابانە...!!

باشە...! ئەی ئەوەی لە ڕێگا تف دەكا یان ئەو شوفێرانەی ڕێگای سووڕانەوە لە شوفێری تر دەگرن یاخود بە پێچەوانەی یاسا دەجوڵێن و تەنگەبەری لە شەقامەكان دروست دەدەن و...ئەی ئەوی تر...ئەوی تریش...و..!!

خوا عەفویان كا...كوا زەوق و سەلیقەی ڕەفتاكردنیان!؟

باشه بۆ گەنجەکانمان بڕوادار نابن...؟ لە کاتێکدا ئایینمان هەموو شتێکە و هەموو پێداویستی یەکانی ژیانمان ئامادە دەکات...!؟ بەخوا هەرچی ویست و حەزو ئارەزوو وئاواتت هەیە لە ئایینەکەتا دەیدۆزیتەوە...

ئەم فەرموودەیەت بەسە...!!

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (فریشتەکان بەوە ئەزیەت دەخۆن کە ئادەمیزاد پـێی ئەزیـەت دەخـوات)...بـۆ نموونـە جگەرەکێشان خـەڵك ئەزیـەت دەدات ونارەحـەتیان دەکـات بەمـە فریـشتەکانیش ئەزیەتیان پێ دەگا و نارەحەت دەبن...

هەروەها تف کردن لە ڕێگادا ئازار بـە فریـشتەکان دەگەیـەنێ چونکە ئازار بە خەڵك دەگەیەنێ.

گەر لەم فەرموودەیە تێگەیشتبی ئەوا بەسـە بـۆ ئـەوەی جـێ بە جێی بکەی چونکە ئەوە وەك هێمایەك نیشانت دەدات.

ڕەوشتێکی جوانـە...ڕەوشـتی چۆنیەتی ڕەفتـار کـردن لەگـەڵ فریشتەکاندا...! ئەوە چ ڕەفتارێکە کە ئیسلام فێرمان دەکات!

## ڕەوشتێکی گرنگ

## بە تایبەتی لەم ڕۆژگارەدا

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

(نەکەن لە ڕێگاوبان دانیشن، ئەگەر ناچاری دانیشن بوون ئەوا دەبێ مافی ڕێگاوبان بدەن کە ئەویش: چاو بەرزنەکەنەوەو نەزمرنەکەنە ، ئازاری خەڵك نەدەن، وەلآمی سەلام بدەنەوە، وە فەرمان بە کارو کردەوەی چاك بدەن و وە قەدەغەی کارو کردەوەی خراپ بکەن) [1]

سەرگوزشتەیەکی تر هەیە بۆ ئەم فەرموودەیە:

دەفەرموێ ﷺ: (نەکەن دانیشن لە ڕێگاوبان)، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا نیازی دانیشتنمان بەیەکەوە گفتوگۆو قسە کردنە نە زیاتر، فەرمووی ﷺ: (ئەگەر ناچاری دانیشتن بوون ئەوا دەبێ مافی ڕێگاوبان بدەن)، گوتیان: مافی ڕێگاوبان چی یە ئەی نێردراوی خودا ؟ فەرمووی ﷺ: (چاو نزم کەنەوە و نەزمرنەکەن، واز لە ئازاردانی خەڵك بێنن، وەلآمی سەلام بدەنەوە، وە فەرمان بە کارو کردەوەی چاك بدەن و قەدەغەی کارو کردەوەی خراپ بکەن).

کەواتە ئیسلام بەرنامەی بۆ داناوی گەر بە ناچاری لە ڕێگاوبان دانیشتی...!!

## هەتا کارێک نەکەن کە ئەوان ئاگادارین

## ﴿حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا﴾

---

[1] رواه البخاري (في الحديث ،٢٤٦٥) و(الحديث، ٦٢٢٩)، و مسلم في (الحديث ،٥٥٢٨) و ابو داود في (الحديث، ٤٨١٥) و الإمام احمد في (الحديث،٤٧/٣).

سەرەتا لە ماڵ بووین پاشان چووینە دەرەوە بۆ سەر شەقام وشۆستەكان، ئێستا گەیشتینە ئەو ماڵەی كەوا سەردانیان دەكەین.

لێرەدا باسی زەوق و سەلیقەی ڕەفتار كردن دەكەین لە كاتی سەردان و میوانداریدا...بۆ نموونە یەكێك دەچێتە سەردانی یەكێكی تر بە بێ ئەوەی پێشتر كاتی دیاری كردبێ، ئینجا دەڵێ: چی تێدایە ئەوە هاوڕێمە... ئەوە برامە...

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا﴾ [(١)]

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە ماڵێكی تر جگە لە ماڵەكانی خۆتان هەتا كارێك بكەن كە ئەوان ئاگاداربن (وەكو زەنگ لێدان یان لە دەرگادان)...مانای (تستأنسوا) واتە: جەخت بكەنە سەر ئەوەی بزانن كە ئەوان ئامادەن بۆ پێشوازیتان یان نە.

كارێكیش بكەن تا ئاگادارببنەوە، مانای ئەم ڕستەیە لە چەرخی بیست و یەكدا واتا: بە تەلەفۆن و یان بە مۆبایل ئاگاداری دەكەیتەوە تاكو كاتێك بۆ سەردان دیاری بكەن... ووشەی(تستأنسوا) هەر هەمووی جوانییە ، سەلیقەی بەرزە و ڕێزلێنانە ، واتە زامنی

---

[(١)] سورة النور:٢٧.

دەكـەیت كـە ئـەو خـۆی بـۆت ئامـادە كـردووە و كـاتی بـۆ تـەرخان كردووی و دڵی پێت خۆشە و ڕووی بۆت گەشە !

خەڵكانێك هەن لـە ڕادە بـەدەر هەسـتیارن!...ئـەو كەسـە بـۆ نموونە بە تەلەفون پەیوەندیت پێ دەكات بۆ دیـاری كردنـی كاتیـچك بۆ سەردان...ئیتر هەر كە گوێبیـستی دەنگـت بـوو، ئـەوا یەكـسەر لای ئەو نیشانەی پاڵنەرە بۆ هاتن یان بە پێچەوانەوە...

هەنـدێك جـار پـێش كـاتی دیـاری كـراو دێـت و پاكانـەت بـۆ دەكات...ئاخر لەوانەیە لەو كاتەدا تۆ نەتوانی پێشوازی ئـەو بكـەیت، لەبەرئەوە ئەو تووڕە دەبێ و قیامەت هەڵدەستێ... پاكی و بێگـەردی بۆ خوا !! زەوقی بەرز ئەوەیە كە تووڕە نەبیت.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ﴾ [١]

واتـە (ئەگـەر پێتـان ووتـرا بگەڕێنـەوە (كاتمـان نـی یـە، یان كارمان هەیە) بگەڕێنەوە (بە بێ دڵگرانی) ئەوە چاكترە بۆتان).

خوشـكەكەم...براكـەم گـەر پێـت گـوترا بگـەڕێوە، بگـەڕێوە، نەكەی تووڕەبیت و دڵگران بیت ئەوە بۆتۆ باشترە و چاكترە.

---

[١] سورة النور،٢٧.

## كە لە دەرگاتان دا لە لايەكی دەرگاكە بوەستن

لە ڕەفتارە نادروست و سەرسوڕهێنەرەكان...سەير دەكەی ميوان وا لە دەرگادەدات يان وا لە زەنگەكە دەدات لە ناوەندی دەرگاش وەستاوە بەرامبەر چاوە تەسيلمەكان هەردوو دەستيشی لەسەر هەردوولای دەرگاكە داناوە...خەيالی ئەم ديمەنە سەيرە بكە...ئاخر ئێمە وا پەروەردەكراوين كە ئەم جۆرە ڕەفتارە نادروستە و بێ شەرمىيە.

پێغەمبەری خوا ﷺ چارەسەری ئەم ڕەفتارەی كردووە بەم ڕێنماييەی خوارەوە كە دەفەرموێ:

(كاتێك چوويتە ماڵێك لە دەرگات دا بەرامبەر دەرگا مەوەستە، بەڵكو لە لايەكی دەرگاكە بوەستە).

### ئيزن وەرگرتن سێ جارە

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (ئيزن وەرگرتن سێ جارە ئەگەر ئيزنت پێ نەدرا بگەڕێوە)...وە لە نێوان هەر سێ جارەكە كەمێك چاوەڕوان بكە تاكو دەرفەت بۆ خاوەن ماڵ بڕەخسێ بۆ ئەوەی دەرگات لێ بكاتەوە چونكە لەوانەيە ئەو لە نوێژدا بێت يان لە گەرماو يان...

لەم ڕۆژگارەدا کارو کردەوەی سەیر سەیر هەیە: (باس بکە یان بیکە و نە قەدەغەیە و نە تاوانە !!)... بۆ نموونە دەستی لەسەر زەنگی ماڵەکە داناوە و هەڵیناگرێت...یان لەخوارەوە یەك بە دەنگی خۆی بانگی خاوەن ماڵ دەکات کە هەموو خەڵك گوێی لێ دەبێت وبۆی دێنە دەرەوە تەنها ئەو کەسە نەبێت کە بانگی دەکات...!!

ئەو ڕستەیە دووبارە بخوێنەوە: (ئەگەر ڕوخسەتت پێ نەدرا بگەڕێوە).

ڕەفتارێکی پڕهەست وسەلیقەیەکی ڕێکە لە کاتی سەرداندا کە ئەگەر ڕوخسەتت پێ درا بچیتە ژوورەوە ئەگەریش نا بگەڕێیەوە...کە ئەوە ئەوپەڕی هەست کردنە.

**من... من... من...**

لەو کاتەی لە زەنگی ماڵەکە دەدرێت... لە ژوورەوە دەپرسرێ: کێ لە دەرگایە؟ کێ یە؟ ئەویش وەڵام دەداتەوە: منم ، ئەویش هەر دەڵێ ئێ کێ یە لە دەرگا؟ وەڵامەکە ناگۆڕێت: من...منم...خۆمانین...ئاخر ئیسلام ڕێنمایی کردووینە و هەمیشە فێرمان دەکات کە ئەگەر یەکێك لێی پرسی: کێ یە لەبەر دەرگا ؟ دەبێ بڵێی: من( فلانم...)

ڕۆژێك جابری کوڕی عبدالله هات و گوتی: لە دەرگای ماڵی پێغەمبەرم ﷺ دا فەرمووی: (کێ یە) منیش گوتم: منم...یەکسەر

لــه ژوورەوە گــوێم لــه دەنگــی پێغەمبــەر ﷺ بــوو فــەرمووی: (مــن...مــنم) ، هەســتم کــرد کــه بــەم قــسەیە ڕقــی هەڵــسا و پێــی نارەحەت بوو.

پاکی و بێگەردی بۆ خوا...١٤٠٠ساڵ لەوەوپێش ئایینی ئیسلام هاتووە ڕەچاوی هەموو شتێکی گەورە و بچوکی کردووە و بەرنامـەی بۆ دارِشتووە.

**نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی لە هەر شتێکدا بێت ئەوا هەر جوانی دەکات**

جۆرە کەسێك هەن ڕەچاوی ڕەوشتە گشتی یەکان ناکەن...بۆ نموونە کە دەچێتە هەر شوێنێك جا ئەو شوێنە مـاڵ بێـت ، پەیـژەی (بلند کەرەوە)ی ئۆتێلێك بێت...یان هەر شوێنێکی تر...سەیر دەکەی وا بە توندی دەرگاکە دادەخات جارێك خـەڵك ئـەتۆقێنێت...جارێکی تر شووشەی دەرگاکە دەشکێنێت...

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (نـەرم ونیـانی ولەسـەرخۆیی لـە هەر شتێکا بێت ئەوا هەر جوانی دەکات، وە نەرم نیانی ولەسـەخۆیی لەهەر شتێکدا هاتە دەرەوە ئەوا هەر عەیبدارو لەکەداری دەکات)

توخوا ئەم فەرموودەیە ڕاستەڕێ بە.

## چۆن ئاوا دەکەیت

هەندێ جار یەکێك لە هاورێکانت لە رۆژێکی دیاری کراو داوەتت دەکات بۆ ژەمی نیوەرۆ ، تۆش لە کاتی دیاری کراوا دەچیتە داوەتەکە بەلام کەسێکی ترت لەگەڵەو بەتەنها نیت، خاوەن مالیش بەم رەوشتەی تۆ دەشلەژێ ، ئاخر ئەو تەنها تۆی داوەت کردووە.

رۆژێك پێغەمبەرﷺ خۆی و پێنج لە هاوەلانی داوەتی لای پیاوێك بوون لە ئەنصارەکان، لەو کاتەی پێغەمبەر و هاوەلانی بە رێگاوە بوون هاوەڵێکی تر شوێنیان کەوت و هەر لەگەڵیان رۆیشت هەتا گەیشتنە مالەکە، یەکسەر پێغەمبەرﷺ بە خاوەن مالەکەی فەرموو: (ئەو کەسە شوێنمان کەوت ئەگەر دەتەوێ ئیزنی هاتنە ژوورەوەی بدە ئەگەریش ناتەوێ با بگەرێتەوە) ئەویش گوتی: رووخسەت بۆ ئەو هەیە با بێتە ژوورەوە ئەی نێردراوی خودا.

لێرەدا پێغەمبەرﷺ دەستپێشخەری دەکات و بە بێ وەستان هەڵوێستەکە بۆ خاوەن مال روون دەکاتەوەو هەڵبژاردنەکە دەداتە دەست ئەو کە ئەگەر بیەوێ ئەو کەسە زیادە بێنێتە ژوورەوە یان نا هەتا تووشی خەجالەتی و تەنگانە نەبێت.

ئەی ئێستا کوا ئەو هەستە ؟!

گەر کەسێکی ترت لەگەڵ خۆتا برد کە داوەت نەکراوە ئەوا خەجالەتی و شووڕەیی یە بە تایبەتی بۆ خاوەن مال و کەس و کاری

ماڵ...لەوانەیە خواردنەکە یان چێشتەکە بۆ ژمارەیەکی دیاری کراو ئامادەکرابێ...ئەگەر ژمارەی کەسەکان زیادی کرد چار چی یە؟

**بێ ئابڕوویی... !!**

کەسی وا هەیە کە دەچێتە ماڵی هاوڕێکەی ، وەك ساروخ چاوی دەبزوێنێتە سەر تەلەفۆنی ماڵەکە ، ئیدی هەر کە تەلەفۆنەکەی بینی ئەوا بێ‌وەستان داوا لە هاوڕێکەی دەکات کەوا پەیوەندی‌یەکی تەلەفۆنی زۆر بە پەلەی هەیە دەشزانێت کە هاوڕێی دڵسۆز داواکاریەکەی جێبەجێ دەکات...ئاخر چۆن جێبە جێی ناکات وا تەلەفۆنەکەی گرتۆتە دەست و دەیەوێت پەیوەندی بکات!!...لەوانەشە بۆ شارێکی تر تەلەفۆن بکات جا چەند دەخایەنێت با بخایەنێت !!

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (ئەو شتەی کە بە توندی ڕوو و وە بەبێ ئابڕوویی وەربگیرێ حەڕامە).

هەر کەسێك خاوەن سەلیقەی جوان بێت لە ڕەفتارو کردەوەیدا ئەوا ڕەچاوی ئابڕووی خەڵك دەکات...

یان تەماشای قەڵەمی ناو گیرفانی هاوڕێکەی دەکات و پێی دەڵێ: ئای لەو قەڵەمە جوانە!! (ئاخر ئەو ووشەیە مانای هەیە) ئینجا هاوڕێکەی چی پێ ناکرێ تەنها ئەوەندە بڵێ ، فەرموو

قەڵەمەكە با بۆ تۆبێ ! ئەویش قەڵەمەكەی لێ وەردەگرێت...بە داخەوە...

خەڵكانێك هەن وەستای ئەم جۆرە ئیشانەن...

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ بەسە بۆ ئەم جۆرە كەسانە: (ئەو شتەی كە بە توندی ڕوو و وە بەبێ ئابڕوویی وەربگیرێ حەرامە).

## ئەگەر نانەكەتان خوارد بڵاوەی لێ بكەن

زۆربەی خەڵك دوای نان خواردن تووشی تەمبەڵی دەبن و هەڵناسن و حەز لە پشووێك دەكەن...ئەم جۆرە ڕەوشتە تا رادەیەك پەسندە گەر لە ماڵی خۆتا بوویت بەڵام ئەگەر لە ماڵی هاوڕێیەكت یان لە هەر ماڵێكی تر بوویت ئەوەیان نابێ و ناپەسندە...!!

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا﴾(١)

واتە: ( هەر كە خۆراكتان خوارد بڵاوە بكەن). ڕۆژێكیان پیاوێك چووە سەردانی ئیمام شافیعی...ئەو پیاوە هەر دانیشت و دانیشت ئیتر دانیشتنەكەی درێژەی خایاند... چەند كاتەكە درێژتر دەبۆوە ئیمامی شافیعی دەچوو خواردنی بۆ دەهێنا هەتا بڕوا...وە هەروەها...پاش ئەو هەموو كاتە، پیاوەكە بە ئیمام شافیعی گوت:

(١) سورة الاحزاب:٥٣.

دەترسم بارم قورس بووبێ لەسەرت، ئیمام شافیعیش پێ ی گوت: تۆ لەماڵەکەی خۆشتا هەر قورسی لەسەرم و ڕەزات قورسە!!

هەرچەندە ئەم هەڵوێستە هەست بریندار دەکات بەڵام ئیمامی شافعی وریا بوو لەسەر ئەوەی هەستی پیاوەکە بریندار نەکات وە بە گفتێکی جوانیش ئەمەی گوت...ئەم ڕستەیەش دوو مانا دەدات... پیاوەکەش چۆن تێیدەگات کەیفی خۆیەتی.

## ڕەوشتی باوکی ئەیوبی ئەنساری

تا ڕادەیەك دروستە کە جار بە جار ببیتە میوانی خزم و کەسانی نزیکی خۆت جا ڕۆژێك بێ، دووان ، سێیان...ئیترکەس وکاری ماڵەکە پێشوازیت دەکەن و خانمی ماڵیش لە پێناو ڕەزامەندی خوا و لەبەر دڵی مێردەکەی خزمەتێکی چاکی میوانەکە دەکات بەڵام ئەگەر مانەوەی ئەو میوانە گەیشتە هەفتەیەك ئەوا قیامەت هەڵدەستێ...ئیدی میوان ئێسکی قورس دەبێت، چونکە ئەوان لەم هەڵسوکەوتە بێ سەلیقەیەی ئەو هەر ئەوەندە خۆیان ڕاگرت...بەڵام کە گەیشتە هەفتەیەك...!!

برای بەڕێز...لەم سەرگوزشتەی خوارەوە فێری میواندارێتی بە...

کاتێك پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد لە مەککەوە بۆ مەدینە ،لە ماڵی باوکی ئەیوبی ئەنساری دابەزی ئیتر لەو ماڵە مایەوە تا

تەواوبوونی دروست کردنی ماڵ و مزگەوتی پێغەمبەرﷺ...ماڵی باوکی ئەیوبی ئەنساریش دووقات بوو، باوکی ئەیوب گوتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، بە دایك و باوکەوە بەفیدات بین ، حەزم لێ نی یە و پێشم زۆر نارەواو نادروستە کە تۆ لە قاتی خوارەوە بیت و منیش لە قاتی سەرەوە ، تۆ بچۆ سەرەوە، ئێمەش با لە خوارەوەی تۆ بین)

باوکی ئەیوب وای پێ باشتربوو کە خۆی لە قاتی خوارەوە بێت تاوەکو پێ یەکانی لەسەرەوەی پێغەمبەرﷺ نەبێ...سەلیقەیەکی جوانە و ئەوپەڕی ڕەوشت بەرزییە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ...

باشە ئەگەر پێغەمبەرﷺ لەسەرەوە بێت، ئەوا لە هەر خوڵەکێك کۆمەڵە خەڵکانێك دەچنە سەرەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺ...ئیتر ئەبو ئەیوب و خێزانەکەی حەوانەوەو هێمنی و خۆشگوزەرانی یان لەم ماڵەدا نامێنێ!؟

بەڵام سەیری ڕەوشتی پێغەمبەرﷺ و سەیری شکۆمەندی ئەو بکە ، فەرمووی ﷺ: (ئەی باوکی ئەیوب ئەگەر لە سەرەوەی خانووەکە بین ئەوا پێم خۆشە کە لەگەڵ من و میوانەکانم نەرم و ئارامگر و بە تەحەمول بیت ئەگەر نا ئەوا دێینە خوارەوە).

بە ڕاستی ئەبوو ئەیوب لەوپەڕی ڕەوشت بەرزی و ڕێزدایە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ... بەڵام کوا مامەڵەی ئەو بەرامبەر مامەڵەی پێغەمبەرﷺ...

ئایا تێبینی ئەوەتان نەکردووە کە ئێمە تا ئێستاش لەگەڵ سەلیقە و ڕەوشتی پێغەمبەرﷺ و یاوەرە چاکەکانی دەژین؟

وە ئایا بارودۆخی ڕۆژئاوایی یەکان لەو سەردەم و لەم ڕۆژگارەدا چۆن بووە و چۆنە؟...ئایا خولق و سەلیقەی مامەڵەکردن و شارستانیەت و پێشکەوتن بەهای ڕۆژئاواییین...؟؟

## هەست کردن نیعمەتە

خەڵکانێك هەن سەردانی ماڵی هاوڕێ و دۆستانییان دەکەن ، هەر کە چوونە ژوورەوە یەکسەر دادەنیشن بە بێ ئیزنی خاوەن ماڵ...بەڵکو لەوە زیاتریش، کە خاوەن ماڵ پێی دەڵێ: باشترە بۆ تۆ لێرە دانیشی، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: نا ئێرە بۆ من خۆشترە !!

پاکی و بێگەردی بۆ خوا...ئاخر لەوانەیە شوێنی دانیشتنەکەی ئەو نەنگی ماڵەکەی لێ دیار بێ کە هەستی کەس وکاری ماڵەکە بریندار دەکات...ئیتر خاوەن ماڵ تکای لێ دەکات ، ئەو شەرم دەکات و ناتوانێ بە ڕاستی پێی بڵێ و تێیگەیەنێ کە شوێنی دانیشتنەکەی نادروستە...میوانیش لەولاوە هەردەڵێی هەستی لەناو بەفرگرەدایە و بەستوویەتی!!...ئەوسا خاوەن ماڵ دەگاتە باری نیگەرانی و وەڕس بوون کە بە ئاشکرا پێی دەڵێ: ئێ دە کاکی من خۆزگە لەو شوێنە دەچوویتە ئەو شوێنە هەتا خێزانەکەم بە ئازادی

بتوانێـت هاتووچـۆ بكـات...ناچـار كـاكی میـوان هەڵدەسـتێ و دەڵـێ: ببورە !!

سوونتەت ئەوەیە كە سەردانی ماڵێك دەكەیت نابێ دانیـشیت هـەتا شـوێنێكی دانیـشتنت بـۆ تـەرخان نـەكرێ..كـاكی مـن تـا ڕووخسەتت پێ نەدرێ دامەنیشە، وە كە دانیشتی لەو شوێنە دانیـشە كە بۆت تەرخان دەكرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (كەس لە شوێنی نووستنی كەسێكی تر دانەنیشێت تەنها بە ئیزنی ئەو نەبێ).

ئایا ئەو مرۆڤە لای خەڵك خۆشەویست نییە كە ئەو هەموو سیفەتە ناسكانە و ئەو هەموو خووە جوانانە و ئـەو هـەموو سـەلیقە شـیرینانەی تیـا كۆبۆتـەوە؟...ئایـا ئـەو مرۆڤـە مرۆڤێكـی شارسـتانی نییە؟...خۆ شارستانیەت تەنها شێوازی زانستە تازەكان نییە ، بەڵكو ڕەوشـت بـەرزی ، خـوو و سـەلیقەی جـوان ، شـكۆمەندی و...شـتی تریشە.

## خوا پشتیوانت بێ ئەی نیمام...!!

هەروەها لە زەوق وسەلیقەكانی ئیسلامی بۆ چوونە سەردانی نەخۆش ئەوەیە كە نابێ سەردانەكەت درێژە بخایەنێ... واتە زەوقـی جوان ئەوەیە كە سەردانەكە سووك وكورت بێت ، درێژە نەدات تەنها ئەگەر نەخۆشەكە بەخۆی حەز لە مانەوەت بكات وە دڵی پێت خۆش

بێت و هۆگرت بێت...لەم بوارەدا چیرۆکێکی خۆش بۆ ئیمامی باوکی حەنیفە هەیە کە دەگێڕنەوە دەڵێن:

ڕۆژێک ئیمام نەخۆش بوو، چوار پیاو هاتنە سەردانی...دانیشتنەکەیان درێژەی خایاند ، ئەوەندە مانەوە تا ڕەزایان زۆر قورس بوو ، ئیتر ئیمامیان زۆر ماندوو ونارەحەت کرد...ناچار ئیمام پێیانی گوت: هەڵسن خودای گەورە چاکی کردمەوە...!!

بیرێك بکەوە بگاتە ئەو ڕادەیە نەخۆش ئەوەندە لێت بێزار بێت؟! دەترسم تۆ لەو جۆرە کەسانە بیت!

لێرەدا ئیسلام پەروەردەمان دەکات و فێری ئەوەمان دەکات کە ڕەچاوی بارودۆخ و چاودێری باری تەندروستی نەخۆشەکە بکەین.

تۆش بە تیلەی چاو سەرنج بدە و هەست بکە بزانە ئاخۆ نەخۆشەکە بەهۆی مانەوەت و زۆر دانیشتنت لێت وەڕس نەبووە و باری دەروونی نەشڵەژاوە...باوەڕ بکە ئەگەر تۆ زیرەك بیت ئەوا یەکسەر بە دەنگ هەڵبڕین و هێما و خەندەی ڕووی تێدەگەیت.

## هەر ئیسلامە پەروەردەمان دەکات

ئێستا ڕوو دەکەینە سەر بابەتێکی تر کە خوو و خولقی مامەڵکردنە لەگەڵ دراوسێ...ئیسلام فێری ئەوەی کردووینە کە

ئەگەر گەڕایتەوە ماڵەوە و خۆراکێکی نایاب یان میوەیەکت بەدەستەوە بوو لەو کاتەش یەکێك لە دراوسێکانت ئەم خواردنە نایابەی بینی ، ئەوا دەبێ هەندێکیان بدەیتێ ئەوا ئەگەر خواردنەکەت نەشاردبێتەوە...وە دەبێ بەوپەڕی ڕەزامەندیەوە و بە نیازێکی پاك خواردنەکەیان بدەیتێ جا زۆر بێ یان کەم.

پاکی و بێگەردی بۆ خوا... هی وا هەیە هەر بە ئەنقەست دەیەوێ دراوسێکەی خواردنە بەتامەکەی دەستی ببینێت یاخود لای دراوسێکەی باسی خواردنە خۆش و بەلەززەتەکە دەکات کە لە ماڵەوە خواردویەتی و خۆی پێ هەڵدەکێشێ !!

ئایا ئەوە ئەو ڕەوشتەیە کە ئیسلام فێری کردووینە...؟! ئایا ئیسلام وای پەروەردەکردووی؟

هەروەها لەو خوو و سەلیقانەی کە ئیسلام فێری کردووینە ئەوەیە کە نابێ دیوارت لەسەر دیواری دراوسێکەت بەرزبکەیتەوە تەنها بە ئیزن و ڕوخسەتی ئەو نەبێ... هەندێك کەس خانووەکەی دروست دەکا و بەرزیدەکاتەوە بەبێ ئەوەی ڕوخسەت بخوازێ هەستی دراوسێکەی فەرامۆش دەکات...

ئیتر ئەو دراوسێیە کە پێشتر دڵخۆش بوو، ئێستا وا غەمبارە چونکە ئێستا هیچ هەناسە و هەوایەك بۆ ماڵەکەی نەماوە ، تەنانەت هەتاویش لێی نادات.

بـرای بـەرێزم مـاڵی خۆتـە خـانوو دروسـت بکـەی و بـەرزی بکەیتەوە...بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ چاودێری هەستی دراوسێکەت بکەیت و زووتر ڕوخسەتی لێ بخوازی... هەر چۆنێك بێـت ئـەو ڕازی دەبێت...بەڵام کە ئیزنت لێ وەرگرت ئەوا هەست دەکات کـە بایـەخی پـێ دەدرێـت و فـەرامۆش نـەکراوە و ڕای وەردەگـیرێ...دەی ئێـستا کامەت پێ باشترە...؟!

## سەلیقە و خولقی مامەڵەکردن لە مزگەوتا

لـەو ڕەوشـت و یاسـایانەی کـە ئیـسلام فێـری کردووینـە چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردنە لە مزگەوتدا کە ئەویش ئەوەیە : لەسەر شان و ملی خەڵکا باز نـەدەین ، جێگای براکەت بکەیتـەوە و شـوێنی تـەنگ نەکـەیت ، پـاك و خـاوێنی مزگـەوت بپارێزیـت وە حورمـەتی بگریت.

مزگەوت ماڵی خوایە...سوور بـە لەسـەر ئـەوەی لـە مزگـەوت لەوپـەڕی سـەلیقە و لەوپـەڕی ڕەوشـت بەرزیـدا بیـت...یەکـەمین ڕەوشتیش : (لەسەر شان و ملی خەڵك باز نەدەین).

## مۆبایل فریشتەکان ئازار دەدات

وە هـەروەها لـە کـاتی چـوونە مزگـەوتا، دەبـێ مۆبایـل و هەڵگیراوەکان بکوژێنرێنەوە کە ئەوە کـارێکی گرنگە، جاروبـار تـۆ وا لـە مـاڵی خـودای و خـەباتت کـردووە و چـێژ لـە نوێـژەکانت

وەردەگریت...بیرت بۆ لای خودا ڕۆیشتووە...زۆر دڵنیا و ئاسوودەی، لە پڕ زەنگی مۆبایلەکەت لێدەدات...ئای لەبەر بەدبەختیت لەو ساتەدا...

جاروبار وا ڕوودەدات ، وایە؟ داوا لە هەموو کەسێك دەکەم کە مۆبایلەکەی دابخات بۆ پارێزگاری خۆی تا لە لایەن نوێژکەرانەوە نەفرەت و نزای خراپی لێ نەکرێ!! ئاخر دەنگی مۆبایل نارەحەتیان دەکات دواتر فریشتەکانیش نارەحەت دەبن.

## یەکەم جار تێبگە

خەڵکانێك هەنە لەسەر هەندێك شت ڕاهاتوونە کە هیچ بنچینە و بنەمایەکی لە سووننەتی ئیسلامدا نییە...کاتێك کە ئێمە دێین ئەم جۆرە شتانە ڕاست بکەینەوە ئەوا بە شێوازێکی هەڵە ڕاستیان دەکەینەوە کە خەڵك ڕقیان هەڵدەستێ وە لێمان دووردەکەونەوە ئەوەش بەهۆی نەبوونی تێگەیشتنی تەواو...وە بەهۆی نەبوونی شێوازێکی چاك لە ئاخاوتن و لەبەر مامەڵەکردنی نادروست لەگەڵ ئەم جۆرە خەڵکانە...

ئەم هەڵوێستە سادەیەی خوارەوە بەڵگە و نیشانەیە کە چەند مانایەکی گەورە دەبەخشێت:

پیاوێکی بەتەمەن لە نوێژدا وەستا بوو ، گەنجێکی ئیمانداریش لە تەنیشتییەوە بوو...کاتێك ئیمام تەواو بوو ، پیاوە

بـه تەمەنەكـە دەسـتی درێـژ كـرد بـۆ كـوڕە گەنجەكـە و گـوتی: (حرما)...كوڕە گەنجـە ئیماندارەكـەش بـە تـووڕەیی و گـرژی سـەیری كرد و گوتی: (حرمـا) لـە سـوننەتدا نـی یـە و بـاس نـەكراوە ! ئینجا پیاوە بە تەمەنەكە گوتی: ئەی ئایا كـەمی خـوو و سـەلیقەی نـزم لـە سوننەتدا باس كراوە !!؟

پاكی و بێگەردی بۆ خودا... خۆ ڕاستە پیاوەكە هەڵەیە...ئەم دوو ووشـەیە (حرمـا و جمعـا) ڕەوشـت و نـەریتێكی بـاوە خـەڵك لەسەری ڕاهاتوون كـە هـیچ بنـچینە و بنەمایـەكی لـە ئاییـندا نییـە، بـەڵام پیـاوە بـە تەمەنـە هـەر لەسـەر ئـەو هەڵوێـستەی خـۆی دەمێنێتەوە بەهۆی نەبوونی قسەی بە حیكمەت و ئامۆژگـاری ڕاسـت و دروست لە لایەن ئەو گەنجە ئیماندارەوە.

توخوا...باش لە ئایینەكەت تێبگە، لەگەڵ خەڵك ڕووخـۆش و دڵ فراوان بە و با ڕەفتار و مامەڵەت لەگەڵیان پوخت و دروست بێت چونكە خوو وسەلیقەی بەرز لە قسەكردن و ڕەفتاری نەرم ودروسـت كلیلی هەموو دڵێكە.

**پشوویەك**

ئێستا كاتی پشوودانە...مێرگێك بۆ گیانی خۆت دروسـت بكـە وەكـو بڵێـی وا لـە ژێـر سـێبەرەكەیدا ڕاكـشاوی و پـشووت داوە...كـزە بایەكی نەرم و فێنك دڵ و دەروونتـی ئـارام و هـێمن كردۆتـەوە...لـەو

مێرگەدا هەندێك شتت بیر دەکەوێتەوە...ئەو هەستە ناسکە کە تەنها بــــە ســـەرنجی چــــاوەکان و خەنـــدەی ڕوو ووریـــای هەڵـــەکان دەبێتـەوە...ئـەی چوار چینە خەڵکەت لـەبیرە کـە باسمـان کـرد وە ووتمان کە تۆ یـەکێکی لـەوان؟!... ئـەی ئـەومت بـیر مـاوە کـە ووتمـان زەوق وسەلیقەی بەرز لە ئاخاوتن و ڕەفتارکردن ڕەوشتێکی بنەڕەتی ئیسلامیەیە وە بۆ ئایینەکەی خۆمان دەگەڕێتەوە...پاشان باسی ئـەو هەموو سەلیقەنەمان کرد کە لە ڕەفتـار و هەڵسوکەوتی پێغەمبـەردا (ﷺ) بەدیـدەکرا وە لـە دوای ئـەو ڕەفتـارو هەڵسوکەوتی هـاوەڵان و شوێن کەوتووانی...

پاش پشوودانت لەو مێرگە پیرۆزەدا هۆشت بـە ئاگا بێنـەوەو و بـیرو بۆچـوونەکانت کۆبکـەرەوە...بزانــە ئێـستا گەیـشتینە کـوێی بابەکەمان؟

پێش ئەوەی لەم باسانەی پێشتر بێینە دەرەوە دەمەوێ ئێستا بڕیار بدەیت وەها بگۆڕێیت کە ببیتە خاوەن دڵ و گیـانێکی ڕوونـاك وە خواست و حەزێکی بلێسەداری داگیرساو ، نیازیشت نوێ بکەیتـەوە و ئاواتــەکانت بەخەبــەر بێنیتــەوەو زینــدووی کەیتــەوە...دەی بــا بەردەوام بین لەوەی دەستمان پێ کرد...

## شێوازی دروست له بانگەوازكردن بۆ خودا...
## (با له مندالآن فێر بین)

ئەم چیرۆكەی خوارەوە بۆ هەموو ئەو كەسانەیە كە بانگەواز بۆ خوا دەكەن و با هەمیشە بیكەن بە ئەلقەی گوێیان.

ڕۆژێكیان حەسەن و حوسێن هەردوو كوڕە كچی پێغەمبەرﷺ پیاوێكیان بینی دەست نوێژی بە جوانی نەدەشووشت...هەردووكیان چوونە لای پیاوەكە ،حەسەن گوتی؛ كاكە: ئەو برایەم خۆی لە من بە چاكتر دەزانێ لە دەست نوێژ هەلگرتنا ، منیش سوێند دەخۆم كە من دەست نوێژێك دەشۆم وەك دەست نوێژ شووشتنی پێغەمبەرﷺ، تۆش لە نێوانماندا ناوبژیوان بە و بزانە دەستنوێژ شووشتنی كاممان باشترە و كامەمان وەك پێغەمبەرﷺ دەست نوێژ دەشۆین.

یەكەم جار حەسەن چووە ژوورەوە بە چاكترین شێوە دەست نوێژی شووشت، پاشان حوسێن چووە ژوورەوە و ئەویش وەك براكەی دەست نوێژی شووشت.

ئەوجا پیاوەكە گوتی؛ بە خوا، من وەكو ئێوە نازانم بە چاكی دەست نوێژ هەلگرم.

دە تۆش خولق وخووی دروست لە بانگەواز كردن بۆ خوا لە هەڵسوكەوتی ئەو دوو منالە فێربە...

## میزکردنێک بە پێکەنینت دێنێ

پیاوێکی ئەعرابی هاتە ناو مزگەوت و میزی کرد...بەڵێ میزی کرد، هەر زوو دەزانی ئەو پیاوە چی بەسەر دێت !!

بێ گومان هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بۆی هەڵسان ویستیان لێی بدەن بەڵام پێغەمبەرﷺ نەیهێشت و یەکسەر بەم ڕستەیەی خوارەوە پێشیان کەوت:

( لێی گەڕێن تا میزەکەی تەواو دەکات )

ئەمە سەرسوڕهێنەر نییە گەر هۆکارەکەت زانی... ئاخر بیرێك لەو دیمەنە سەیرەی ئەو پیاوە بکەوە کە لە کاتی میزکردنایە و خەڵکان بە دوای دەکەون و لێی دەدەن...دیمەنەکەت هاتە خەیاڵ؟! چی ڕوودەدات؟!

سەرنجێك بدە شێوازی قسەکردن ولێکدانەوەی پێغەمبەرﷺ...سەرەڕای گەورەیی کردارەکە دەبێ لێکدانەوەیەکی پوخت و بیرێکی باش بکەیتەوە، پاشان قسەکە بکەیت وە یان کارەکە ئەنجام بدەیت.

## پیاوی شیاو بۆ شوێنی شیاو

هەمووومان چیرۆکی بانگدان دەزانین...زەیدی کوڕی ثابت و عومەری کوڕی خەتتاب، هەردووکیان خەویان بینیبوو کە بانگدەدەن...(حەزرەتی جوبرائیل بۆ بانگدان نەهاتە

خـــــــواره‌وه)...هـــــــه‌ردووکیان خه‌ونـــــــه‌کانیان بـــــــۆ پێغه‌مبه‌رﷺگێڕایه‌وه...پێغه‌مبه‌ریشﷺ فه‌رمووی: (ئـه‌و خه‌ونـه ڕاسته)...پاشان به زه‌یدی فه‌رموو: (به‌ڵام به لای بـیلال‌دا تێپـه‌ڕه بـا ئه‌و بێت بانگ بدات چونکه ده‌نگی بیلال له ده‌نگی ئێـوه خۆشـتره و شیاوتره).

ئـه‌وه نرخێکـی جـوان و به‌هایـه‌کی شارسـتانی‌یه...کـه ده‌ڵێن فیسار که‌س له‌م پیشه‌یه زانا و دانایه: نه‌ك له‌به‌رئه‌وه‌ی ئه‌و لـه خـوا نـزیکتره وه‌ك لـه که‌سـانی تـر...بـه‌ڵام کـه ده‌ڵێن: فیـسار کـه‌س لـه‌م پیـشه‌یه‌دا زانـا و دانایـه که‌وایـه ئـه‌م پیـشه‌یه بـۆ ئـه‌و په‌سـندتره و شیاوتره...که ئه‌وه‌ش بناغه‌یه‌که لـه بناغـه‌کانی سـه‌رکه‌وتن لـه هـه‌ر ئیشێکدا یان له هه‌ر پیشه‌یه‌کدا...پێغه‌مبه‌رﷺ ١٤٠٠ سـاڵ له‌مه‌وبـه‌ر بنه‌مایـه‌کی گـرنگ لـه بنـه‌ماکانی زانـستی کـارگێری داده‌مـه‌زرێنێت: (پیاوی شیاو بۆ شوێنی شیاو).

لـه‌م ڕۆژگـاره‌دا هـه‌زاره‌ها بانگـده‌ر ده‌رکه‌وتوونـه و لـه کـاتی بانگدانا شانازی به ده‌نگه‌خۆشـه‌که‌ی خۆیـان ده‌که‌ن تـه‌نها له‌به‌رئـه‌م ده‌سته‌واژه‌یه‌ی خواره‌وه که پێغه‌مبـه‌رﷺ فـه‌رمووی: (بـه‌ڵام ده‌نگی بیلال له ده‌نگی تۆ خۆشتره و شیاوتره).

**ئایا ئێمه تۆمان فه‌وتاند ئه‌ی کوڕه‌که...!؟**

گەنجێك هەبوو دراوسێی ئیمامی باوکی حەنیفە بوو کە دیواری پشتەوەی ماڵەکەی بە دیواری پشت ماڵی ئیمامەوە بوو)...ئەو گەنجە مەی دەخواردەوە وە بە درێژایی شەو هەر سەرخۆش بوو ئینجا بەدەم سەرخۆشییەوە گۆرانی دەگوت ودەیووت: منیان فەوتاند منیان لە دەست دا بەڵام چ کوڕێکیشیان فەوتاند ولە دەستیان دا... هەموو ڕۆژێ هەر لەسەر ئەم بارودۆخەدا بوو وە هەمان ڕستەی دەووتەوە...ئیمام باوکی حەنیفەش هەموو ڕۆژێ بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستا وە بەردەوام دەنگە دەنگی ئەو کوڕە بێزاری دەکرد...ئیمام هەر دەیویست هەڵێکی گونجاو بدۆزێتەوە بۆ نەرم بوونەوەی دڵی ئەو گەنجە داڵاوە، ڕۆژێکیان ئیمام لە خەو هەڵسا بۆ نوێژی بەیانی، گوێی لە دەنگی ئەو نەبوو، ئیتر گەڕا بەدوای بیدۆزێتەوە وە لێی پرسی ،پاشان زانی کە ئەو کوڕە گەنجە لە بەندیخانە گیراوە...!! چونکە بە بەردەوامی مەی دەخواردەوە...ئیمامی باوکی حەنیفە چووە سەردانی داوای کرد کە دەری بێنن وگوتی: بۆ بۆ من دەری ناهێنن...!؟ ئەوان گوتیان: ئاخر ئەو مەی خواردۆتەوە !! ئەویش گوتی: لەبەر خاتری من دەری بێنن...ئینجا دەریان هێنا...باوکی حەنیفەش بەبێدەنگی وەری گرت و لە دواوەی خۆی سواری هێسترەکەی کرد وهیچ قسەیەکیشی لەگەڵدا نەکرد هەتا گەیشتنە ماڵەوە...ئەو کات ئیمام گوتی: ئایا

ئێمەینە کە تۆمان فەوتاندووە ئەی کوڕەکە؟ ئەویش گوتی: نە سوێند بەخوا چی تر ناگەڕێمەوە سەری.

ئەوەیە ئەنجام و ئاکامی خوڵق و سەلیقەی نەرم و پڕ لە بەزەیی...؟ ئاخر ئەو مەی دەخواردەوە...!!

زۆرلە گەنجانی ئێمە سەرەڕای گشت ئەو کردەوە خراپانەی کە ئەنجامی دەدەن بەڵام هەر بە پاکی دروست بوونە و هەر کە لە دایك بوونە پاکن و باشن، بەڵام نموونەی پێشەوایەکی وەکو ئیمامی باوکی حەنیفەیان نەدۆزیوەتەوە کە هەڵێك بقۆزێتەوە و دەرفەتێکی گونجاو هەڵبژێری کە بە ووشەیەکی نەرم و پڕ لە بەزەیی هەموو دەرگا داخراوەکانیان بۆ بکاتەوە...یاخود ئەو دەرگایانەیان بۆ بکاتەوە کە گومانیان بۆی دەبرد کە داخراوە...!!

چۆن خەڵك ڕقی لێت نەبێتەوە!!...

لێرەوە کۆتاییمان هێنا لە کورتە باسی سەلیقە و خوڵق وشێوازی بانگەوازکردن بۆ خوا، ئێستا ڕوو دەکەینە بابەتێکی تر ، ئەویش سەلیقەو چۆنیەتی قسەکردن و ئاخاوتن لەگەڵ خەڵکدا بەگشتی کە خۆشییەك و میهرەبانیەکی زۆر زۆری تێدایە...

یەکەمین هەڵە کە دەیکەیت ئەوەیە کە تۆ قسەی بەرامبەرەکەت دەبڕیت و گوێ لە ڕای ئەو ناگریت کە ئەمە سەلیقەیەکی نزمە لە ئاخاوتندا...

هـەر كـە ويـستت خـەڵك ڕقـى لێـت بێتـەوە و لێـت دووركەوێتەوە ئەوا قسەيان ببڕە دەرفەتيان مەدەرێ كە لـە ڕوانگـەى خۆياندا ڕاى خۆيان دەبڕن !!! هـەر جارێكيش كـە بيرو بۆچوونێكى خـۆى نمـايش دەكـات پێـى بڵـێ ئـەوە هەڵەيـە و ڕاى لـەوە باشـترم هەيە...ئەو هەڵوێستەش هەميشە هەستێكى واى بۆ دروست دەكا كە ئەو هيچ تێناگات، چونكە بەردەوام تۆ سەرزەنشتى دەكـەيت وهەڵـەى لێـدەگريت...جـا ئەگـەر هـەموو لەوانـەت ئـەنجام دا خـەڵك لێـت دووردەكەنەوە و حەز لە ديدەنت ناكەن...ئەى تۆ چى دەڵێى؟!

## قسەكانت تەواو بوو ئەى باوكى وەليد...!؟

لـە لاپـەڕەى پێـشوو باسـى هەنـدێ هەڵـسوكەوتمان كـرد كـە ئەگەر ئەنجامى بدەيت ئەوا دەبێتە هـۆى ڕق لێبوونـەوەى خـەڵك بـۆ تۆ وە دووركەوتنەوەيان لێت...

بـا لـە پێغەمبـەرﷺ فێـر بـين و بـزانين كـە چـۆن خـەڵك خۆشيان دەوێـت و ڕێزىدەگرن...بـە خـوا ئەوانـەى خوارەوە چـەند ووشـەيەكن دەخوێنـدرێت تـەنها بـۆ ئـەوەى خـەڵك فێـرى شـێوازى قسەكردن و فێرى هونەرى گفتوگۆ ببێت.

عوتبەى كوڕى ڕەبيعە نوێنەر وگەورەى كافران بـوو، ڕۆژێـك هاتە لاى پێغەمبەرﷺ دانيشت و گوتى: كوڕە براكەم، گـوێم لێبگـرە و چەند قسەيەكت بۆ دەكەم چاوەرێ بـە بـەڵكو هەنـدێكيانت بـە دڵ

دەبێت و پەسندی دەکەیت، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: (بەڵێ فەرموو باوکی وەلید گوێم لێتە)، گوتی: کوڕە براکەم گەر تۆ لەو کار ومەسەلەیەی کە هێناوتە پارەت دەوێ ئەوا ئێمە لە پارەی خۆمان پارەت بۆ کۆدەکەینەوە تا ببیتە دەوڵەمەندترین کەس...!!، وە ئەگەر پاشایەتیت دەوێ ئەوا دەتکەینە سەرکردە و پاشای خۆمان...!! ئەگەریش ئەوەی بۆت دێت تەنها خەونێکە دەبینیت و تۆش ناتوانیت نەفس و گیانی خۆتی لێ دەرباز بکەیت و بەرپەرچی بدەیتەوە ئەوا ئێمە پزیشکت بۆ دێنین تا چارەسەرت بکات.

ئەو شتانە چەند هەڵبژاردنێکی لاواز و بێهێزە...! پارە، پاشایەتی و سەرداریەتی، چارەسەرکردن لە نەخۆشی بەڵام سەیری سەلیقە و خووی گفتوگۆکردنی پێغەمبەرﷺ بکە کە بە نازناوی دەستی پێ کرد :(باوکی وەلید) کە ئەوە سەلیقەیەکی نەرم و خۆشە لە ئاخاوتندا، فەرمووی: (بڵێ باوکی وەلید گوێم لێتە) ئیتر ئەو گوێی بۆ گرت وە بە هیچ شێوەیەك قسەکانی نەبڕی هەتا هەر هەمووی تەواو کرد...ئەوجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (تەواو بووی، لە قسەکانت بوویتەوە ئەی باوکی وەلید) گوتی: بەڵێ...مانای ئەوە لە چەرخی بیست و یەکدا واتە: (جەنابت تەواو بووی) پاشان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (گوێ لە من بگرە)، گوتی: باشە وا دەکەم، ئیتر پێغەمبەر سورەتی (فصلت) ی خوێندەوە وفەرمووی: بِسْمِ اللهِ

الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ ﴿ حم ۞ تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۞ كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ۞ بَشِيراً وَنَذِيراً فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ ... ۞﴾[1]

پێغەمبەر بەردەوام بوو لە خوێندنەوەی ئەم سورەتە تا گەیشتە ئایەتی١٣ کە خوا تیایدا دەفەرموێ:

﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾[2]

(ئایەتی ١٣باسی سزاو تۆڵەی خوا دەکات بۆ لاسار و کافران)، عوتبە یەکسەر بە ترس و لەرزەوە هەڵسا و دەستی خستە سەر زاری پێغەمبەرﷺو گوتی:

(لە ڕاهی ئەوخوایە و لەبەر خزمایەتی بێ دەنگ بە تەواوی نەکەی).

باوکی وەلید ترسا لەوەی سزاکە بێتە سەریان، ئەوجا پێغەمبەرﷺ بێ دەنگ بوو.

ئەوە خووی قسەکردنی پێغەمبەرﷺ بوو لەگەڵ پیاوێکی کافر...!!

ئێمەش دەبێ خووی گفتوگۆکردنمان لەگەڵ خەڵکدا ئاوا بێت...

---

[1] سوره فصلت ١-٤.

[2] سورة فصلت١-١٣.

بەراستی ئێمە لەم ڕۆژگارەدا پێویستمان بەم جۆرە خوڕەوشتە هەیە...خەڵکانێك هەن قسەیان ڕەقە وەك بەرد بە جۆرێك کە گوێگر بریندار دەکات...

**خۆزیا لە شوێن تۆ بووینایە ئەی عەدداس...!!**

ئەم نموونەیە بۆ تۆیە ئەی ئەو کەسەی تێنووە وماندووە کە چەندەها کات بە شەو بەرۆژ بیری لە چۆنیەتی خەباتی بانگەوازکردن کردۆتەوە بۆ ئایینی خوا...ئەمە نموونەیەکی هونەری وزانستی بانگهێشکردنە بۆ پەیام و ئایینی خوا... (خوایە تێگەیشتن و فێربوونێکی وەکو پێغەمبەرانت لێ داوا دەکەین)... هەموومان دەزانین کە پێغەمبەرمانﷺ لە طائیف چی بەسەرهات...هەر ج کۆیلە و نەفام هەیە هەمووی دوای پێغەمبەرﷺ کەوتن جنێویان دەدایێ و هاواریان لەسەر دەکرد ، و بەرد بارانیان کرد تا کەوشەکەی پڕ بوو لە خوێن، زەیدی کوڕی حارسەی لەگەڵ بوو کە بە لەش و گیانی خۆی پێغەمبەری پاراست لە ئاکامدا سەری شکا. زەید نەیدەتوانی ئەو نەفامانە لە پێغەمبەرﷺ دووربخاتەوە ئیدی هەر ڕایانکرد تا گەیشتنە پەنا دیواری باخچەی عوتبە و شەیبەی هەردوو کوڕەکەی ڕەبیعە. ئەوسا خەڵکەکە کشانەوە وگەڕانەوە ،...ئینجا پێغەمبەرﷺ چووە ناو باخێکی تریێ ولە ژێرسێبەری دارمێوێکدا دانیشت...کە هەردوو کوڕەکەی ڕەبیعە ئەمەیان بینی بەزەییان پێ

هاتەوە و خزمەتکارێکی خۆیان بۆ نارد کە نەسرانی (مەسیحی) بوو پێیان ووت: عەدداس، ئەم هێشووە ترێیە وەرگرە و بیبە بۆ ئەو پیاوە.

عەدداسیش ڕۆیشت و هێشووە ترێکەی لە ژێر دەستی پێغەمبەرﷺ دانا ئەویش دەستی بۆ درێژ کرد و فەرمووی: (بەناوی خوا) ئینجا خواردی.

عەدداسیش گوتی: خەڵکی ئەم وولاتە ئەم جۆرە قسەیە ناکەن.

فەرمووی: ناوت چی یە؟

گوتی: ناوم عەدداسە

فەرمووی: عەدداس تۆ لە چ وولاتێکی؟

عەدداس گوتی: لە نەینەوا (موسڵ)

فەرمووی: لە وولاتی پیاوە چاکەکە (یونسی کوڕی مەتی)؟؟!!!

عەدداس گوتی: تۆ یونس کوڕی مەتی لە کوێ دەناسیت؟

فەرمووی: ئەو برامە، ئەو پێغەمبەر بوو منیش پێغەمبەرم.

عەدداسیش یەکسەر تاوی پێغەمبەریﷺ دا و داهاتەوە هەردوو دەست و پێ یەکانی ماچ کرد.

با ئەم گفتوگۆیە شیبکەینەوە تا بزانین کە هۆی چی بوو عەدداس تاوی سەرو قاچ و دەستی پێغەمبەری ﷺ دا و ماچیانی کرد؟

١- سەرەتا: یەکەم قسەی پێغەمبەرﷺ: (بە ناوی خوا) بوو کەخۆی لە خۆیدا بانگەوازێکە، بانگخواز ئاوا دەبێ کە هەمیشە ووشەی ئیمان لەسەر زاریەتی...وە بە بەدەوامی لە هەموو شوێنێك و لە هەموو هەڵوێستێك ڕاستیەکان ئاشکرا دەکات و ئالأی (بەناوی خوا) بەرز دەکاتەوە.

٢- دووەم: پێغەمبەرﷺ لە ناوی پرسی...ئەوەش گرنگترین وانەیە بۆ فێربوونی شێوازی بانگەوازکردن بۆ ئایینی خوا چونکە زانینی ناوی کەس ووشەیەکی نهێنیە بۆ ڕاکێشانی دڵی خەڵك.

٣- سێ یەم: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (عەدداس تۆ لە چ وولاتێکی؟) ناوەکەی بەکارهێنا بۆ ئەوەی لە بیریئەکا... تۆش جاروبار کاتی یەکتر ناسین دەڵێی: ناوت چیە؟ ئەویش دەڵێ ناوم: (ئەحمەدە) وە پاش چەند ساتێك پێی دەڵێی بە خوای موحەمەد زۆر خۆشحاڵم بە ناسینت!! ئەویش پێت دەڵێ: ناوم ئەحمەدە...تۆش پێ ی دەڵێی: ببورە زۆر تێبینیم نەکرد...وە لەو کاتەی کە دەیەوێ بڕوات پێی دەڵێ: خوات لەگەڵ کاك...؟ بەخوا ناوەکەتم لە بیرکرد کاکە...لە پێغەمبەرﷺ فێر بە و زوو ناو بەکار بێنە پێش ئەوەی لە بیرت چێت.

٤- چوارەم: پێغەمبەرﷺ لە وولاتەکەی پرسی، هەر کە ئەو گوتی: لە نەینەوام، یەکسەر فەرمووی: (لە وولاتی پیاوە چاکەکە یونس کوڕی مەتی) ناوی باوکی هێنا بۆ ئەوەی کاریگەرتر بێت...

بۆ زیاتر شارەزابوون و زیادبوونی خۆشەویستی لە کاتی یەکتر ناسینا ، ناوی ئەو کەسانە بێنە کە تۆ دەیانناسیت و لە شاری ئەون، ئا بەم شێوەیە بەربەستە ڕەقەکەی نێوانتان تۆزێك لادەچێت و یەکترناسینەکە سادەتر دەبێت.

٥- ئەوە سەلیقەیەکی بەرزە کە دەفەرموێ: (ئەو برامە ئەو پێغەمبەر بوو منیش پێغەمبەرم) ووشەی (برام) هەمووی بەزەیی و هۆگری و خۆشەویستی یە...تێبینی ئەم شێوازە گفتوگۆیە بکە لە خۆشەویستیمانﷺ کە ناوی یونسی پێش ناوی خۆی خست پاشان ناوی خۆی هێنا.

ڕاستە گەر دوو کەس یەکتریان ناسی ئەوا بێگومان هۆگری یەکتر دەبن...ئەم گفتوگۆیەش چەند ساتێك زیاتری نەخایاند کە بووە هۆی تێکەڵ بوون و دۆستایەتییەکی دوورو درێژ...ئەو شتانە بوون کە وای لە عەدداس کرد دابێتەوە و هەردوو دەست و پێیە پیرۆزەکانی پێغەمبەرﷺ ماچ بکات.

## بەهۆی ڕەوشتی بەرزی ئیسلامی ئینگلیزێک بوو بە موسڵمان

پێغەمبەرﷺ فێری کردووینە کە ئەگەر سێ کەس بەیەکەوە بوون نابێ دووانیان بە تەنها چرپەچرپ بکەن چونکە ئەو ئازاری پێ دەگات...ئەم ئامۆژگاریە بە تایبەتی بۆ ئافرەتانە...

له ساڵی ١٩٨٨ لـه قاهیره کۆیـژی بازرگانیم تـەواوکرد، پاشـان ڕۆیـشتم بـۆ ئینگلتـەرا بـۆ مـاوەی سـاڵێك، کـه لـەو ماوەیـەدا لەگەڵ هەندێ له هاوڕێیانم بەیەکـەوە ئیـشمان دەکـرد وە ئـەو شوێنەی کـه ئیشمان لێدەکرد کچێکی ئینگلیزی لێ بوو.

کـچه ئینگلیزەکـه بـوو بـه موسـڵمان، موسـڵمان بـوونی ئـەو کچەش بەسەرهاتێکی خۆش بوو...ئێمه لێـرەدا بـه پێـی فـەرموودەی پێغەمبـەرﷺ سـەبارەت بـه چـرپەکردن دەڵێین؛ ئەگـەر سێ کـەس بەیەکەوە بوون، دووانیان به زمانێك قسەیان کرد کە کەسـی سێیەم نەزانێت بەو زمانە قسە بکات، ئـەوا بـه پێـی ئـەم فەرموودەیـه ئـەم جۆرە قسەکردنە قەدەغەکراوە...دیسان با بگەڕێینەوە بۆ بەسـەرهاتی ئەم ئافرەتە ئینـگلیزە، ئەو کات دوو هاوڕێم بە ئینگلیـزی و عـەرەبی گفتوگۆیان دەکرد...کاتێـك کـه بـه تـەنها بـوون بـه عـەرەبی قـسەیان دەکرد، کاتێکیش کـه ئافرەتـه ئینگلیزەکـه دەهاتـه لایـان زبانەکەیان دەگـۆڕی بـۆ ئینگلیـزی...ئـەم هەڵوێـستەیان چـەند جارێـك دووپـات کـردەوە...تـا ئافرەتـه ئینگلیزەکـه بـەم ڕەفتـارە سـەری سـوڕما و بیریکردەوە ویستی هۆیەکەی بزانێـت...ئـیتر هـەردووکیان بەیەکـەوە تێیان گەیاند و وتیان: پێغەمبەرﷺ ئەوەی لێمـان قەدەغـه کـردووە کە دووانمان بە زمانێك بدوێن سێیەممان لێی تێنەگا ئینجا ئافرەتـه ئینگلیزەکـه تێگەیـشت و بـه زمـانی ئینگلیـزی گـوتی: وا دیـارە پێغەمبـەری ئێـوە زۆر شارسـتانیه...ئیـدی دوای شـەش مـانگ ئـەو

کچە گەنجە بوو بە موسوڵمان و گوتی: یەکەم شت کە چووە دڵمەوە خوڵق وسەلیقەی ئیسلامی بوو لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی تر.

خۆشەویستان... ئایینمان مەزنە و جوانە...کەم و کوڕی خۆمان نەبێت هیچ کەم وکوڕیەکی تێدا نیە

لە ئایینەکەت تێبگە و بەو بژی دەورووبەری خۆت و هەموو جیهان چاك دەسازێ...ئەوە بزانە کە هەموو دونیا پێویستی بە ئیسلام هەیە...بەڵام ئایا تۆ لەو کەسانەی کە بتوانێت ئەم بارە هەڵگرێت و بیگرێتە ئەستۆی خۆی...؟ ئایا دەتوانیت بڵێی؟، بەڵێ حەز دەکەم لەو جۆرە کەسانە بم...خۆشەویستان بۆ هەموو وتەیەك ڕاستیەك هەیە...!!

پەروەردەکردنێکی زۆر بەرز

خووی دروست لە قسەکردنا ئەوەیە کە دەبێ هەمیشە زمانت پاك و پاراو بێت وە هەرگیز وشە و قسەی خراپ و ناشیرینی لێ نەیەتە دەرەوە هەتا ئەگەر بە گاڵتەش بێت...!!

ڕۆژێکیان یەك لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کوڕە بچووکەکەی بە ڕێگادا دەڕۆیشتن و سەگێکیان بینی و بەلایانا تێپەڕی ، مناڵەکە وتی: ڕەت بە هەی سەگی کوڕی سەگ، باوکی پێی وت: جارێکی تر ئەو قسەیە نەکەی ،کوڕەکە گوتی: لەبەر چی باوکە؟ ئەی ئەو سەگی کوڕی سەگ نیە؟! باوکەکە گوتی: کوڕەکەم، ئەگەر

بۆ ریسوا بوون و سووك كردن وات ووتبێ ئەوا قەت نابێ ئەو قسەیە لە زارت بێتە دەرەوە.

لــەو پەروەردەكردنـــە...!؟ ئـــەوە پـــەروەردەكردنێكی زۆر بەرزە...دەی با ئێمە هەر ئێستا پەیمان ببەستین چیتر قسەی خـراپ و ناشـــیرین لـــە زارمـــان نەیەتـــە دەرەوە كـــە هەســـتی خـــەڵكی برینداردەكات هەتا ئەگەر قسەكە ڕاست بێت...

ئەوەی زمانی لەسەر وشـە و قـسەی پوخـت و پـاك ڕاهاتبێـت مەحاڵە پـەنا بباتـە بـەر قـسەی ناشـیرین ...دەگێڕنـەوە ڕۆژێـك پیـاو چاكێك لەگەڵ هاوەڵانی بە ڕێگایەكدا ڕۆیشتن و بەرازێكی مردوویـان بینی، كە بۆنی بۆگەنی لێدەهات و شێوەی تەحەمول نەدەكرا، ئینجا هەریەك لـەمان دەسـتیان كـرد بـەو قـسانە، ئـای كـە پیـسە...، چـەند ناشـیرینە...، بـۆنی چـەند ناخۆشـە، بـەڵام پیـاو چـاكەكە گـوتی، ددانەكانی چەند سپین!! ئەوان لەو ووشـەیە سـەریان سـوڕما ئـەویش گـوتی، ئـاخر مـن زمـانم لەسـەر شـتی ناشـیرین و وشـەی خـراپ ڕانەهاتووە.

## سرووەی چەند ئایاتێک لە قورئانی پیرۆزدا

ئێمـە لـە بابـەتی خوڵـق و خـووی دروسـت لـە گفتوگـۆ و مامەڵەكردنـدا،...دەمانـەوێت بەشـێوەیەكی وەهـا لـەم بابەتـە بێینـە دەرەوە كـە چـیتر خـەڵك ئازارنـەدەین و هەستیـان بریندارنەكـەین

ئەگەر هەرچییەکی کردبێت، پێغەمبەرﷺ ئەگەر کاروکردەوەیەکی خراپی لە یەکێك بەدی بکردایە ئەوا هەرگیز ناوی نەدەهێنا و ئاشکرای نەکرد، بەڵکو دەیفەرمووﷺ: ( ئەوا ئەو کەسانە چییانە ئاوا و ئاوا دەکەن)، قەت ناوەکەی ئاشکرا نەکرد بۆ پارێزگاریکردنی هەست و سۆزی ئەو کەسە بۆ ئەوەی بریندار نەبێت کە ئەوەش سەلیقەو خووێکی هەرە بەرزە لە قسەکردنا...تۆش ببە کەسێکی وا کە بە چاوەکانت سەرنج بدەی و وردبیتەوە هەر کە هەستت کرد ئەو قسەی وا دەیڵێی دڵی بەرامبەرەکەتی پێ توند دەبێت ئەوا هەر مەیڵێ باشترەا...

بۆ ئەم مەبەستەش واتە بۆ فێر بوونی پاراستن و ڕاگرتنی هەستی کەسانی تر، ئەم چەند ئایەتە قورئانییانەی خوارەوە بخوێنەرەوە و سوودیان لێ وەرگرە هەرگیز زەرەر ناکەیت.

هەموومان چیرۆکی حەزرەتی یوسف دەزانین کە ئەو دووچاری چەندین تاقیکردنەوە بۆتەوە یەك لەو تاقیکردنەوانە پیلان گێڕانی براکانی بوو بۆ کوشتنی.

خوای گەورە دەفەرموێ:

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ ﴿ وَقَالَ يَا أَبَتِ هَـذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَـايَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّاً وَقَدْ أَحْسَنَ بَي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ﴾ [١]

---

[١] سورة يوسف:١٠٠.

واتــه: (يوسـف گـوتى: بـاوكى بـەڕێزم ئەمــە لێكدانــەوەى خەونەكـەى ئەوسـامە كـە بــە منـداڵى بينــيم، ئەوەتــە بێگومـان پـەروەردگارم هێنايـەدى و بـە ڕاسـت دەرچـوو، بـە ڕاسـتى ئـەو زاتـە چاكەى لەگەڵدا كردم و بە سۆز بوو بـۆم، كاتێـك لـە زينـدان ڕزگـارى كردم)... با ئيعجاز و ڕەوشت و ئەدەبى ئەم ئايەتە ڕوون بكەينەوە...

ئەگەر يوسف بيگوتابا: (بـە ڕاسـتى ئـەو زاتـە چاكەى لەگەڵ كـردم و بـە سـۆز بـوو لەگـەڵم، كاتێـك لـە زينـدان و بيرەكـە ڕزگـارى كردم) بەڵام ئەو ناوى زيندانى هێنا و ناوى بيرەكەى نەهێنا.

باشە ، لەبەچى ناوى بيرەكەى نەهێنا؟

چونكە لەبەرئەوەى براكانى بەرامبـەرى وەسـتا بـوون ئەگـەر ناوى (بيرەكەى) بهێنايە ئـەوا هەسـتيانى بريـندار دەكـرد...بـەڵام لـە هەمان كاتيشا بە نهێنى سوپاس و شوكرانە و ستايـشى خـواى كـە لـە بيرەكـە دەرىهێنـا نـەك بـە ئاشـكرا بەرامبـەر براكـانى...!! كـە ئـەو دەربڕينە لە قسەكردنا سەليقەيەكى بەرز و شكۆمەندىيە.

پاشان دەفەرموێ:

﴿وَقَدْ أَحْسَنَ بَي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَجَاء بِكُم مِّنَ الْبَدْوِ﴾[١]

---

[١] سورة يوسف:١٠٠.

واته: (ئەو زاتە چاكەی لەگەڵ كردم و بە سۆز بوو بۆم ، كاتێك لە زیندان ڕزگاری كردم، ئەوەتە ئێوەی لە بیابانەوە هێناوە و بە یەكتری شاد كردینەوە)...بزانە لێرە حەزرەتی یوسف چۆن ڕەچاوی هەستی كەسانی تر دەكات چونكە ئەوان لە برسێتییەكی زۆر توندا بوون كە بەم برسێتییە بارو ڕەوشەیان لەوپەڕی خراپیو ناخۆشیو ناهەمواریدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بە نەرمی پێیانی وت: ئەوەتە ئێوەی لە بیابانەوە هێناوە و بە یەكتر شادی كردینەوە.

تەواوكەری ئایەتەكە دەفەرموێ:

﴿وَجَاء بِكُم مِّنَ الْبَدْوِ مِن بَعْدِ أَن نَّزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي﴾ (١)

واتە: ئەوەتە ئێوەی لە بیابانەوە هێناوە و بە یەكتر شاد بووینەوە و دوای ئەوەی شەیتان نێوان من و براكانمی تێكدابوو)...

حەزرەتی یوسف نەیدەویست بە هیچ شێوەیەك هەستی براكانی بریندار بكات و دەرفەتێكی تر بداتە دەست شەیتان...!!

یەكسەر گوتی ( ئەوە شەیتان بوو نێوان من و براكانمی تێكدابوو)...

بزانە لەم ڕۆژگارە دا چی دەفەرموێ وچی ڕوودەدات...سەیر دەكەی ژنەكە بە ئەنقەست قسەی ڕەق دەكات بۆ ئەوەی دراوسێكەی

---

(١) سورة یوسف:١٠٠.

ئازار بدات...یان بە قسەکانی منەت لەسەرئەوەی تر دەکات هەر ئەوەتە نایکوژێت...

نموونەی وەکو تۆمان دەوێت ئەی یوسفی ڕاستگۆ...

## دەبێ مامەڵەکردنمان لەگەڵ خەڵکدا بە پێی ئاستی ئەوان بێت

سوننەتە کە دەبێ مامەڵەکردنمان لەگەڵ خەڵکدا بە پێی ئاست و پلە و پایەی ئەوان بێت، بۆ نموونە: مامۆستای زانکۆ، مامۆستای قوتابخانە، باوك، کەسانی بە پلەو پایە...کەواتە هەریەك بەپێی ئاستی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، تەنها لە کاتی جەنگ نەبێت.

پێغەمبەرﷺ نامەیەك بۆ کیسرا پاشای فارس دەنێرێت کە ئاگر پەرست بوو وە پێی دەفەرموێ: (لە موحەممەد نێردراوی خودا بۆ کسرا شکۆداری فارس).

وە نامەیەکیش بۆ هەرقەلی پاشای ڕۆمەکان دەنێرێت کە تیایدا دەفەرموێ: (لە موحەممەد نێرداوی خودا بۆ هەرقەل شکۆداری ڕۆم).

بەڵام ئێمە بە پێی ڕەوشت و خولقی خۆمان مامەڵە لەگەڵ خەڵك دەکەین نەك بە پێی ڕەوشتی ئەوان...نەکەی بە مامۆستاکەت بڵێی: (تۆ)، چونکە ئەم کردەوەیە پێچەوانەی سوننەتی

پێغەمبەرەﷺ، دەبێ بڵێی: (بەڕێزت) یان: (جەنابت)...با بە ڕەوشت وخوڵقی ئیسلامی بازدانێك لە کۆمەڵگاکەمان ڕوویدا!...با خووی بەرز و ڕەوشتی جوان دروست بڵاوبێتەوە...قەت ئەوەش ڕوونادات ئەگەر لە خۆتەوە دەست پێنەکەیت و خۆت خۆت نەگۆڕی...خۆ ئێمە خەڵکانێك لە دەرەوەی وڵات ناهێنین فێری خوڵق و سەلیقەی ئیسلامیيان بکەین و پاشان لەوان بێ کە ئەو ڕەوشتە بنوێنن...!!

## ڕەوشتی عەباس

وە لە ڕەوشتە گرنگەکان...خووت لەگەڵ ئەو کەسانەی کە چاکە و پیاوەتیيان لەسەر تۆ هەیە...بەسە ئیتر لاسایی کردنەوە و ڕێزنەگرتنت لە مامۆستاکەت!! ئاخر ئەو کردەوانەی کە تۆ ئەنجامیان دەدەیت لە ئیسلامدا نیيە..نەکەی بڵێی خەتای مامۆستاکەمە ، ئەو دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساندووینە...!! ئەگەر قسەکانت وایە و ڕاستە ئەوا بارت قورستر دەبێت و ماندووبوونەکەت زیاتر دەبێت...بەلأم ئەو کەسەی ئایینی خۆی لا شیرینە...وە ئەو کەسەی کە لە پێناوی ئاییندا قوربانی داوە، ئەوا بە نەفسی دەڵێ: گەر دەتەوێ لە ڕێگای خوا بموەستێنی ئەوا منیش بەجێت دێڵم و دەڕۆم بۆ لای خوا !!

هەر کەسێك چاکە و پیاوەتی لەسەرت هەبێ...ماف لەسەرت هەیە،...یەك لەو مافانە چاك ڕەفتارکردن و پاکخووی و ڕەوشت باشییە لەگەڵی...

ناسراوە کە عەبباس بەتەمەن لە پێغەمبەرﷺ گەورەترە.

کاتێك عەبباس پرسیاری لێکرا: ئایا تۆ گەورەتری یان پێغەمبەری خواﷺ ؟

گوتی: ئەو لە من گەورەترە و منیش پێش ئەو لە دایك بوومە.

ئەم وەڵامە چەند ووشەیەکی ناسکەو پڕە لە خۆشەویستی و خووی جوان...

## تۆ نەبی کەسی تر نەو

## کارە ناکات نەی نەبا بەکر

کاتێك پێغەمبەرﷺ لەگەڵ گەورەمان ئەبوبەکر کۆچی کرد ئەنسارەکان لە دەروازەی مەدینە وەستابوون چاوەڕێی پێغەمبەریانﷺ دەکرد...ئەوان پێغەمبەریان نەدەناسی هەر لە دوورەوە دوو کەسیان بینی دەهاتن، ئیمامی ئەبوبەکر لە پێشەوە دەڕۆی بۆ پارێزگاریکردنی پێغەمبەر ، ئەنسارەکان گومانی ئەوەیان برد کە ئەبوبەکر پێغەمبەر بێت بۆیە خێرا بەرەو ئەبوبەکر چوون و جلەوی ووشترەکەی ئیمامی ئەبوبەکریان ڕاکێشاو و بردیان.

ئەمـە هەڵوێـستێکی شـکانەوە بـوو بـۆ ئەبوبـەکر... بـەڵام ئەبوبـەکر لـەم هەڵوێـستەدا چـیت کـرد؟...خـۆ نـەتوت: نـا نـا مـن پێغەمبـەری خـوا نـیم مـن ئەبوبـەکرم؟...، ئـەو وای نـەگوت بـەڵکو یەکـسەر جلـی خـۆی لەبـەرکردەوە و دای بـە سـەری پێغەمبـەرﷺ (ئەوە سەرنجێکی باش و خوڵقێکی بـەرزە)...ئەنـسارەکانیش یەکسەر زانییـــان کـــە ئـــەو پێغەمبـــەرﷺ نیـیـــە، ئیـــدی خێـــرا بـــەرەو پێغەمبەرﷺ چوون.

بەڕاستی...ئەو ئەبوبەکری ڕاستگۆیە.

## خووڕەوشتی ئیمامی شافیعی

هەنـدێك جـار بـە تایبـەتی لەوانـە تایبـەتی یـەکان (دروس خصوصیە) پەردەی شەرم و ڕێز گـرتن لـە نێوان قوتـابی و مامۆسـتا نامێنێ...بـەڵام سـەیری ئیمـام شـافیعی بکـە کـە لەگـەڵ مامۆسـتاکەی دادەنیـشێ ، دەڵـێ: (مـن لـە ئاسـتی مامۆسـتاکەمدا نـاتوانم لاپـەڕەی کتێبی بەردەستم بەتوندی هەڵدەمەوە تـاوەکو نارەحـەتی نەکـەم، وە هـەرگیز نـاتوانم بەرامبـەر مامۆسـتاکەم ئـاو بخۆمـەوە هـەروەك ڕێزگرتنێك لەبەر گەورەیی ئەو).

دە تۆش خۆت لەسەر ئەم جۆرە قسانە ڕابێنە...

لـەم ڕۆژگـارەدا نموونـەی وەك تۆمـان پێویـستە ئـەی ئیمـامی شافیعی...باشە ، ئەگەر ئێستا ئیمام شـافیعی لەگەڵمانـدا بووایـە و لـە

نێوانماندا بووایە؟...ئەوەی ئێستای بینیبایە کە لە نێوان قوتابی و مامۆستا ڕوودەدات...توخوا چی دەکرد؟!

## خوای گەورە لە سێ کاتدا بێ دەنگی پێ خۆشە

لە کاتی جەنازە و پرسەکاندا سەرت سووڕدەمێنێ لەوەی کە دەیبینی... سەیری خێزانی مردووەکە دەکەی زۆر بە سۆزەوە دەگری...کەچی ئافرەتەکانی تر هەر دەڵێی لە ئاهەنگی قسە کردندان، بەردەوام قسە دەکەن و قسە دەکەن ،... پاکی و بێ گەردی بۆ خوا... قسەکانیان هەر تەواو نابێت ، هەمیشە بۆ گفتوگۆی جۆراوجۆر و بۆ دۆزینەوەی بابەتی نوێ نوێ هێز و توانایەکی ناسروشتی و لە ڕادە بەدەریان هەیە.

وە ئەم دیاردەیە لە ناو پیاوانیش هەیە بەڵام بەڕێژەیەکی کەمتر، هەرچی ژنە ئەوە هێز و توانایان لەم بابەتەدا لە ڕادەبەدەرە و لەسەرەوەی پیاوانن.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (خوای گەورە لە سێ کاتا بێدەنگی پێ خۆشە: لە کاتی شەڕدا لەگەڵ کافران، لە کاتی خوێندنەوەی قورئان، لە کاتی بەڕێ کردنی تەرمی مردوو (کاتی پرسە)...

توخوا ڕەچاوی هەستی کەس و کاری مردووەکە بکەن.

## هاوسەنگی و مامناوەندی

پێش تەواوبوونی باسەکەمان سەبارەت بە شێوازی دروست لە گفتوگۆو مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکا... دووخاڵی گرنگ هەیە کە پێویستە ڕەچاو بکرێت و لە بیر نەکرێت:

یەکەمیان: زیادەڕەوی لە چاك مامەڵکردنا و خووی باشی لە ڕاددەبەدەر مانای خوونزمییە و خوڵق نزمییە...

واتە بە ئەرك و بارگران مەبە...بۆ نموونە ئەوەمان باسکرد کە لە کاتی سەردانی نەخۆشدا نابێ زۆر دانیشیت بەڵام ئەگەر نەخۆش خۆی ئیزنی مانەوەی دای وە خۆی داوای لێکردی کە دانیشی ئەوا لای بمێنیەوە و زیادەڕەوی مەکە بڵێی: من وا فێرکراوم کە نابێ زۆرلای نەخۆش بمێنمەوە...نەخۆشیش وا تکا دەکات و سوێند دەخوا کە لە لای بمێنیتەوە!!...تۆش هەر سووری لەسەر ڕۆیشتن...بەڕێزم، ئاخر ئەم زیادەڕەوییە لەم خوڵقەی تۆ لە خوڵق نزمییەوەیە...هاوسەنگییەك بنوێنە وسوود لەم وتەیەی ئیمامی شافعی وەرگرە کە دەڵێ: (بارگرانترین کەس لە دڵمدا ئەو کەسانەن کە بە ئەرکن بۆم و بۆیان بە ئەرکم وە خۆشەویسترین کەسیش لە دڵمدا ئەو کەسانەن کە ئەگەر لەگەڵیاندا بم وەکو ئەوە وایە کە بەتەنهام).

دووەم: زۆر بەپــەرۆش بــوونی لــە ڕاددە بــەدەر ئــەویش زیادەڕەوییە و دیسان خولقێکی نزمە...پێنەکەنین زیادەڕەوییە...وا تێنەگەی پێنەکەنین خولق وخووێکی ئیسلامییە...

دەبــێ مــرۆڤ بــە شــێوەیەکی ڕاســت و دروســت لــە ئایینەکــەی تێبگات...نە زیادەڕەوی بکات نە کەمتەرخەمی.

## ڕەوشتت لەگەڵ خوا

لێرەدا پێویستە پارێزگاری سێ شت بکەیت...

یەکــەم: پارێزگــاری کــردن و پاراســتنی بــیرو بۆچــوونت، پاراستنیشی بەوە دەبێت کە لە بیرو بۆچوونتدا هیچ کەم و کوریـەك نەخەیتە پاڵ زاتی پەروەردگار...

دووەم: پارێزگـاریکردنی دڵ، ئـەوەش بـەوە دەبێـت کـە دڵـت بێجگە لە خوا ڕوو لە شتی تر نەکات وە هەمیشە وا لـەم دڵـە بکـەیت کە هەردەم بە خۆشەویستی خوا ئـاوەدان بێـت...ئـەوە ڕەوشـت نییـە لەگەڵ خوا کە تۆ لە نوێژدایت و دڵیشت لە لای یەکێکی ترە یـان لای شتێکی ترە.

ســێ یــەم: پارێزگـاری کردنــی کردەوەکانــت، لێــرەدا دەبــێ ئاگـاداری کـارو کردەوەکانـت بیـت ،هەمیـشە ووریـای ئـەوە بیـت کـە کارێکی وا ئەنجام نەدەیت ببێتە مایەی تووڕە بوونی خوای گـەورە...

نەكەی سەیری ئافرەتێك بكەی كە حەلالی تۆ نییە...نەكەی هاوڕێیەتی كچێك بكەی...نەكەی نوێژ جێبێلیت...نەكەی...

ئەگەر وات كرد ئەوا ڕەوشت و كردەوەت لەگەڵ خوا چاك و دروست نییە و خواش لێت دەڕەنجێ.

زاناكان دەڵێن: "هەر كەسێك بەم سێ خاڵە (كە باس كرا) ڕەوشت باش و كردەوە چاك بێت - لە بیرو بۆچوونیدا پاكی و بێگەردی بۆ خوا دابنێت - دڵی هەر لەگەڵ خودا بێت - بە كردەوەكانی خوا ڕازی بكات- ئەوا لەو كەسانەن كە خۆشەویستی خودان".

## پێغەمبەر عیسا و ڕەوشتی لەگەڵ خودا

خوای گەورە لە سورەتی ئەلمائیدەدا دەفەرموێ:

﴿وَإِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـهَيْنِ مِن دُونِ اللّهِ﴾ [1]

واتە: (كاتێكیش خوا (لە قیامەتدا) فەرمووی: ئەی عیسای كوڕی مەریەم، ئایا ئەوە تۆ بە خەڵكیت ووتووە، منیش و دایكیشم بە دوو خوا دابنێن لە خوار خوای پەروەردگارەوە؟

وەڵام دانەوەی پێغەمبەر عیسی ﷺ چی بوو؟... ئایا گوتی: نە خوایە من وام نەوتووە...

---

[1] سورة المائدة:١١٦.

بەڵکو ئەو وتی: ﴿قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾[1]

واتە: ( پێغەمبەر عیسا لە وەڵامدا گوتی: پاکی و بێگەردی و بێهاوەڵی شایستەی تۆیە، بۆم نی یە من شتێك بڵێم بۆ خۆم کە ماق من نەبێت؟! (چۆن حەق بە خۆم دەدەم شتی وا بێت بە زارمدا؟!) خۆ ئەگەر شتی وام وتبێت ئەوە بە ڕاستی تۆ دەیزانیت و لێت شاراوە نیە، چونکە دەزانیت بە هەرچی لە دڵ و دەروونمدا هەیە، بەڵام من نازانم بەوەی کە لە دەریای عیلم و زانستی بێ پایانی تۆدا هەیە، چونکە بە ڕاستی هەر تۆ زانا و شارەزای نهێنی و پەنهانی (بێ گومان تۆ چاك دەزانیت): من هیچ شتێکم پێنەووتوون جگە لەوەی کە تۆ فەرمانت پێداوم ئەویش ئەوەیە: تەنها خوا بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە و من شایەت بووم بەسەریانەوە هەتا لە ناویاندا بووم، ئینجا کاتێك منت مراند و گیانت کێشام، ئیتر ئەوە هەر خۆت چاودێر و ئاگادار بوویت لێیان و هەر تۆش شایەدیت بەسەر هەموو شتێکەوە).

ئەوە جوانترین شێوەی مامەڵەکردنە لەگەڵ خوا...

[1] سورة المائدة:١١٦.

دووباره له ئايەتەكان ووردبەرەوە وە دووبـارە وەلام دانـەوەی عيسای پێغەمبەر بخوێنەرەوە...

هەر دەڵێی يەكەم جارە ئەم ئايەتانە ئەخوێنيتەوە.. !!

ئێمـە زۆر لـە ئايەتـەكانی خـوا دەخوێنينـەوە بـەلام دەڵێـی تێبينی و ڕەچاوی فێر بوونی ناكەين...

له چيرۆكی موسا و خضر كه له سورەتی (ئەلكەهف)دا ڕوون كراوەتەوە...خضر سێ كار ئەنجام دەدا:

يەكەميان: شكانی كەشتيەكە.

دووەميان: كوشتنی منالەكە.

سێ يەميان: دروست كردنی ديوارەكە.

يەكەم و دووەم بە ڕواڵەت كاری خراپ و زيان بەخشن، بـەلام سێ يەميان به ڕواڵەت كاری باش و پوختەيه لەبەرئەو هۆيـه كاتێـك حـەزرەتی خـضر كـه بەسـەرهاتی يەكـەم و دووەم بـۆ موسـا ڕوون دەكاتەوە دەڵێ:

﴿أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا﴾ [1]

---

[1] سورة الكهف: ٧٩.

واته: (ئەو کەشتی یەی کە"عەیبدارم کرد"چەند هەژارێك خاوەنی بوون لە دەریادا کاریان دەکرد، جا منیش ویستم عەیبداری بکەم)، ئەو نەیگوت: خوا ویستی عەیبداری بکا).

پاشان وتی: ﴿وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَاناً وَكُفْراً﴾[1].

واته: (منداڵەکەش"کە کوشتم" دایك و باوکێکی ئیمانداری هەبوو، ترساین لەوەی کە بە سەرکەشی و بێ دینی و خوانەناسی هیلاك و مانوویان بکات (چونکە هەر لە ئێستاوە لاساری و سەرکەشی پێوە دیار بوو).

ئەو نەیوت خوا ترسا (هەرگیز ئەمە نابێ بگوترێ) بەڵام ئەو کە وەڵامی پرسیاری سێیەمی داوە ووتی:

﴿وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحاً فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا﴾

واته: (دیوارەکەش کە چاکم کردەوە، خاوەنەکەی دوو منداڵی هەتیوی شارۆچکەکە بوون، لە ژێریدا گەنجینەیەکی (زێڕ و زیویان) هەبوو (کە باوکیان بۆی شاردبوونەوە، ئەگەر گوێمان پێ نەدایە، باران و لافاو دەری خست و ئەو خەڵکە ڕەزیلەی کە میوانداریان لێ

[1] سورة الكهف، ٨٠.

نەکردین، دەستیان دەکەوت)، باوکی ئەو دوو منداڵەش خواناس بوو و پیاو چاك بوو، جا "پەروەردگارت ویستی" کاتێك گەنجینەکەیان دەست بکەوێت کە گەورە و بەهێزبن، ئەوسا دەری بهێنن)...لێرەدا ئەو گوتی: خوا ویستی...نەیگوت: من ویستم گەنجینەکە دەربێنم، ئەوەش وەك ووتمان لەبەرئەوەی کاری سێیەم بەرواڵەت کارێکی باشە.

ها...!! بۆ ئەوجارە بە تێگەیشتنێکی تەواو ئایەتەکانی قورئان بخوێنەوەو وە بە تەواوی لێی ووردبەرەوە...

## بەد ڕەوشترین کەس لەگەڵ خودا کێیە؟

بەد ڕەوشترین کەس لەگەڵ خودا یەهودیەکانن (جوولەکەکانن) کە گوتیان:

﴿يَدُ اللّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ﴾[1]

واتە: (ئەم جوولەکە نەفام و خوانەناسانە دەیانوت: خوا دەستی بەستراوە و خێری لە دەست نابێتەوە!! دەك دەستیان بەستراو بێ خێر و کەلەپچە و تووشی شەلەل بێت دەك نەفرینیان لێ بێت، لەگەڵ قسەیان، نەخێر وا نی یە، بەڵکو دوو دەستی (پڕ لە بەرەکەتی

[1] المائدة: ٦٤ .

پەروەردگار) هەمیشە و بەردەوام كراوەیە، چۆنی بوێت و چەندی بوێت دەیبەخشێت).

بەدڕەوشتی و بێ ئابڕوویان لەگەڵ خودا دەگاتە ئەو ڕادەیەی ئەوها لەسەرخوا بدوێن.

هەروەها گوتیان:

﴿إِنَّ اللّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاء﴾[1].

واتە: (خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین).

پاكی و بێ گەردی بۆ خوا...بە خوا ئەوان بەد ڕەوشترین و بێ ئابڕووترین خەڵقی خودان ئەوەش لە ئەنجامی گوفتاری نابەجێ و بێ شەرمی و بەد خوویان.

وە خوا نەفرەتی لێكردوون...

هەروەها ئێمەی موسوڵمانیش ڕەوشتمان لەگەڵ خودا جیا جیایە...لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە كە موسوڵمانان بە جوولەكەكان بشوبهێنین...لە مەبەستم تێبگە... بۆ نموونە هەندێك لە ئێمە گوناه و تاوان لەبەر خاتری خودا بەجێ دێڵێ و ڕەوشتی خۆی لەگەڵ خودا چاك دەكات...هەندێكی تریشمان لەو كاتەی وا خەڵك خەوتوونە، ئەو بۆ شەونوێژ هەڵدەستێ ئینجا ڕازاوەترین وجوانترین جل لەبەر دەكا و نایابترین بۆن لە خۆی دەدا...ئەو

---

[2] ال عمران: ١٨١ .

دەیەوەیّ لە شەونوێژیدا بە چاکترین شێوە وە بە باشترین ڕەوشت بە دیداری خودا بگات...کەسی تریشمان هەیە کە پێش هەموو نوێـژێك سیواك بەکاردەهێنیّ تاکو لەگەڵ دیدمنی ئەودا ناو دەمی پاك بێـت و بۆنی خۆش بێت...هی تریـشمان هـەر کە گویّ ی لـە بانگدان بـوو یەکسەر لە کار و پیشەی خۆی دەوەستێت و دەست هەڵدەگرێت ، وە گویّ لـە بـانگ دەگـریّ و ووتـەکانی دەڵێتـەوە وەکـو ڕێزلێنانێـك بـۆ دروشمەکانی خودا...هی تریشمان هەر کە گویّ ی لـە قورئـان دەبێت بیّ دەنگ دەبیّ.

هەمانە وا دەکات و وا دەکات... و....

هەریەکێکمان حاڵەتێکی لەگەڵ خوای میهرەباندا هەیە.

**نموونەی هەرە بەرز بۆ خوایە**

لەم نموونەیە خوارەوە وورد بەرەوە و لێی تێبگە:

ئەگەر پاشایەك هەبێت داوای بەندەیەکی خۆی کرد کە بێتـە خزمەتی...ئایا ڕێگا زیاتر بـە کامیـان دەدات؟ ئایـا ڕێگـا بـە کەسـێکی ڕەوشت نزم دەدات؟ یان بە کەسێکی ڕەوشت بەرز؟

خـوای گـەورە مۆڵـەتی هاتنـە ژوورەوە بـۆ لای خـۆی دەداتـە بەندەکانی بە گوێرەی خوڕەوشتیان لەگەڵ زاتی ئەودا.

ئـای لـەم ووشـانە کـە چ کاریگەریـیـەکیان لـە دڵ و دەروونـدا هەیە...چاوەکان فرمێسکی بۆ دەرژن...ئاخۆ کیّ لە ئێمە حەز نـەکات

لەگەڵ پەروەردگارا لەوپەڕی ڕەوشت بەرزی دا بیت وە سوور بێت لەسەر ئەوەی کە خوا لە خۆی ڕازی بکات !؟

(خوا بە جوانترین شێوە پەروەردەی کردم)

ئایا کێ لە هەموو کەس زیاتر خووپاکتر و ڕەوشت چاکترە لەگەڵ خوای گەورە ؟

لە هەموو کەس خووپاکتر و ڕەوشت چاکتر لەگەڵ خوا پێغەمبەرمانە ﷺ...هەر لەبەرئەوە گەیشتە سدرەی مونتەها...، ئەی نەمانگوت خوای گەورە مۆڵەتی هاتنە ژوورەوە بۆلای خۆی دەداتە بەندەکانی بە گوێرەی خوڕەوشتیان لەگەڵ زاتی ئەودا... پێغەمبەریش ﷺ لە ئیسرا و میعراجدا گەیشتە سدرەی مونتەها کە تا ئێستا کەس نەگەیشتۆتە ئەو شوێنە، خوا دەفەرموێ:

﴿مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى﴾[1]

واتە: (بینینی ئەو بەدیهێنراوانە لەوشەوەدا وە نەبێت چاوبەست لە پێغەمبەر کرا بێت و چاوی لێ لادابێت).

کێ لە تۆ ڕەوشت چاکترە ئەی پێغەمبەری خودا، کە خوای گەورە بە جوانترین شێوە پەروەردەی کردووی.

---

[1] النجم: ١٧.

(الهندی) له (گەنجینەی کرێکاران)دا یادی ئەو خۆشەویستەی کردۆتەوە کە دەفەرموێ: (ادبني ربي فأحسن تأديبي) واتە :(خوا بە چاکترین شێوە پەروەردەی کردم).

لێرەوە بابەتەکەمان کۆتایی هات بە خوای گەورەتان دەسپێرین...ڕێنماییتان دەکەین کە باشترین و جوانترین خوو و خوڵقتان هەبێت ، ئەوە بزانن کە فێربوون و زانیتان وەك لەم ووتە کۆنە ووتراوە: (هاوار بۆ ئەو کەسەی بە یەك جار نەزانیت وتێنەگات، هاواریش بۆ ئەو کەسەی حەوت جار زانیویەتی وتێگەیشتووە).

# خۆنەویستن

## پێشەکی:

کەسانێك لێیان پرسیم باس لە چی دەکەین ، منیش پێم گوتن باسی خۆنەویستن دەکەین بە ئیزنی خودا ، بینیم زۆر بە روونی و راشکاوی پێم دەڵێن؛ (مانای چی یە؟) بەم وەلامە ئاکامێکی ترسناك رووی تێکردم...

وا دیارە هەندێ رەوشتێکی ئیسلامی هەیە کە لە نێوانماندا وە یان لە ناو کۆمەلە خەڵکانێکی زۆری کۆمەڵگاکەماندا سڕاوەتەوە و شوێنەواری نەماوە...

خۆنەویستن رەوشتێکی ئیسلامیەیە و ئیسلام فەرمانی پێ داوە وە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی، وە لە مێژووی ئیسلامدا نموونەی زۆرە...بەداخەوە کە سەیری ئەم رەوشتە دەکەین لەم رۆژگارەدا ، دەبینین سڕاوەتەوە و نەماوە.

ئەی خوایە... ئایا ئێمە بەم رادەیە لە ئایینمان دوورکەوتووینەتەوە؟...بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم رەوشتە لەناو چینێك لە موسوڵمانانندا هەر ماوە، کەسی وا هەیە کە ئێستا

لەنێوانماندایە و ئەم ڕەوشتە جێبە جێ دەكات...تۆش لەوانی بە ئیزنی خودا...

**ئەم ڕەوشتە لای رۆژئاواییەكان نەبووە و نییە**

جێگای سەرسوڕمانە گەر بتەوێ زاراوەی ووشەی (خۆنەویستن) لە زمان و فەرهەنگی بیانیدا بدۆزیتەوە، ئەوا مەحاڵە و هەرگیز ناتوانی... واتە ئەم ووشەیە نە لە زمانی ئینگلیزی وە نە لە فەرەنسی هاوواتای (مرادف)ی نییە... نەك هەر ڕەوشتی خۆنەویستن بەڵكو ڕەوشتی تریش، بۆ نموونە ڕەوشتی (الحیاء ) كە وەگێڕاوەكەی Ashamed یان shy كە هەردووكیان بە مانای (شەرمن) دێن... هیچێكیان مانای (الحیاء) نادەن، وە هەروەها ڕەوشتی (التواضع) هاوواتای (Humble)ە لە فەرهەنگی ئینگلیزی ، Humble؛ واتە زەلیلی و ملكەچی ،كە مانای (التواضع) نادات.

ئەم ڕەوشتە بەرزە ئیسلامییانە هەرگیز لای رۆژئاواییەكاندا نەبووە و نییە، نەك هەر ئەوانە، بەڵكو زۆر ڕەوشتی تریش...

**ڕەوشتێكە لە قوتابخانەی پێغەمبەرﷺ نەبێ لە هیچ شوێنێكی تر نایدۆزینەوە**

ئەمڕۆ ئێمە شوێن رۆژئاواییەكان كوتووین... بەڵام خۆزیا تەكنۆلوجیا و شارستانیەت و زانستە كارگێڕییەكانمان لەوان

وەرگرتابا... بە داخەوە لاسایی کردنەوەیەکی کوێرانەمان لەوان وەرگرتووە...

ئەی ڕەوشت و بەهاکان لەکێ وەربگرین...!؟

وەی بۆ ئەو کەسەی کە بە دوای ڕەوشتە بەرزەکان دەگەڕێ ، هەرگیز نایدۆزێتەوە لە قوتابخانەی پێغەمبەرﷺ نەبێ.

قەت نایدۆزیتەوە تەنها لەناو خەڵکانی بڕوادار بە ئیسلام نەبێ.

## خۆنەویستن مانای چییە؟

خۆنەویستن واتا: براکەت بەسەر خۆت پەسند دەکەی جا بۆ هەر شتێ بێت، بە مانای: (خۆشییەك لە خۆشییەکانی دونیا بۆ خۆت نەتەوێت و بیدەی بە براکەت کە ئەو چێژ و لەززەتی لێ وەرگری وە تۆش لەبەر ئەو لە کیس خۆتی بدەی)...واتە کە دەڵێن فیسار کەس ڕەوشتی خۆنەویستنی هەیە واتە: ئەو خۆی ناوێ بەڵکو براکەی پەسەند دەکاتە سەر نەفسی خۆی ئەوەش لەبەر تامەزرۆی بۆ ڕۆژی دوایی.

ئایا ئێستا تێگەیشتی؟ دەی بە نیازی جێبەجێ کردن خۆت بۆ خوێندنەوەی ئامادە بکە.

### چەند نموونەیەك بۆ جێبە جێکردن

ئێستا باسی چەند نموونەیەکی خۆنەویستن دەکەین لە مێژووی ئایینە شیرینەکەماندا کە بە ڕاستی جێگای شانازی و سەربەرزییە...

پێش ئەوەی ئەم چەند نموونانە باس بکەین، ئەم وتەیەی خوارەوە بخوێنەرەوە تا باش مەبەستمان تێبگەی:

ئەو گەشتیارەی کە بە شەمەندەفەر گەشت و گوزار دەکات بەسەرچەند وێستگەیەك تێدەپەرێت تا دەگاتە وێستگەی سەرەکی کە ئەو مەبەستییەتی... جا وێستگە سەرەکییەکەمان (خۆنەویستنە)، وە وێستگەکای تر ئەم نموونانەن کە ئێستا دەیاخوێنیتەوە...ئیتر بە ئیزنی خودا وێستگە وێستگە دەبڕی و نزیك دەبیتەوە تا دەگەیتە وێستگەی مەبەست...

ئاگاداربە شەمەندەفەر بە بێ سووتەمەنی ناتوانێ بڕوا...ئایا سووتەمەنی بڕوادار چییە؟ زانیت؟

## لەبەرمی بکە و پێی داپۆشە

## ئەی پێغەمبەری خودا... !!

شەوانی زستانی مەدینەی منەوەرە زۆر ساردەو سڕە، شەوێك لەو شەوە ساردانە ئافرەتێك لە ئەنسارەکان عەبایەکی لە قەدیفە چنی و هێنای پێشکەشی پێغەمبەری کردﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ لێی وەرگرت و لەبەری کرد (ئەو لەو سەرما سارد و سڕەدا چەند

پێویستی پێ یەتی)،لەو كاتەی كە یەكەم جارە وا بەم عەبایەوە دەردەچێتە دەرەوە بۆ لای هاوەڵانی ، پیاوێكی ئەنساری لە ڕێگادا سەیری كرد و گوتی: ئای ئەو عەبایە چەند جوان و پوختەیە لەبەرمی بكە و پێی دامپۆشە ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (بەڵێ، باش)، یەكسەر بێ وەستان لەبەری كردەوە و دای بەو... هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ سەیری پیاوەكەیان كردو گوتیان: (ئەوە چیت كرد؟ ئاخر پێغەمبەر پێویستی پێیەتی) پیاوەكەش گوتی: بەڵام من زیاتر لە پێغەمبەرﷺ پێویستیم پێ یە ، من دەمەوێ كاتی مردنم بیكەم بە كفنم[1].

بیرێك بكەوە...قاتێكی تازە و نوێت كڕیوە...یەكەم جارە لەبەری دەكەی و پێی دەردەچیتە دەرەوە یەكسەر هاورێیەكت لە ڕێگادا پێت بڵێ: بمدەرێ... چی دەكەی!!؟

دەزانم جارێ وەڵامەكەت لا نی یە...

ئەو بۆ تۆیە...!!

پێغەمبەر و هاوەڵانی كاتێكی زۆر بە دەردەسەری و نەهامەتی ژیانیان بردۆتە سەر لەبەر هەژاری و برسێتی و نەبوونی... كە بە درێژایی ماوەی ناردنی پەیامی ئیسلامدا هەر بەم شێوەیە ژیانیان بەسەر بردووە، تا گەیشتە فەتحی مەككە و خەیبەر

[1] رواه الإمام أحمد في (الحديث، ٥/٣٣٢) بنحوه.

و فەتحی تائیف، کە ئەو کات پارە و پوول و مەڕو ماڵاتیان زۆر بوو، کە بەشی پێغەمبەرﷺ لە مەڕ و ماڵاتدا، مەڕو ماڵاتێك بوو هەندی نێوان دوو چیا ، ئیعرابیەك سەیری مەڕ و ماڵاتەکەی کرد ، گوتی: ئەو مەڕ و ماڵاتە چەند زۆرە، پێغەمبەریشﷺ پێ ی فەرموو: (بە دڵتە؟) گوتی: بەڵێ، فەرمووی‌ﷺ: (با بۆ تۆ بێت) گوتی: ئەی موحەمەد ڕاستم پێ دەڵێی؟، فەرمووی‌ﷺ: (ئەوە بۆ تۆیە گەر ویستت بیبە) پیاوەکەش یەکسەر بۆ لای مەڕ و ماڵاتەکە ڕای کرد و بە دەوری سوڕایەوە، ئینجا بردی و بۆلای کەس و کارەکەی گەڕایەوە گوتی: ئەی خزمان و کەس و کارانی خۆم ، ئیمان بێنن، ببن بە ئیسلام من ئەوانەم لای بەخشندەترین و چاکترین کەس بۆ هێناون، موحەمەد بەخشینێکی ئاوا دەبەخشێ کە هەرگیز و هەمیشە لە هەژاری ناترسێ)[1].

ئەو پێغەمبەرەی لە تاو توندی برسێتی بەردی لەسەر سکی دەبەست، نەك هەر ئەو ، بەڵکو زۆربەی هاوەڵان...جا هەر کەسێك لەو برسێتی و هەژارییەدا بێت پاشان ببێتە خاوەنی ئەو سەروەت و سامانە (مەڕو ماڵاتێك هەندی نێوان دوو چیا)، خۆ شتێکی ئاساییە ئەگەر ئەو کەسە ئاگاداری سەروەت و سامانەکەی بێت وە پارێزگاری بکات...

---

[1] رواه مسلم في ( الحديث، ٥٩٧٤_٥٩٧٥)، والإمام احمد في (الحديث، ٣/١٠٨)، ١٧٥، ٢٥٩،٢٤٨).

بەڵام سەیری مەودای خۆنەویستنی پێغەمبەرﷺ بکە بزانە تا چ ڕادەیەك بوو...هەر لەبەر ئەو ڕەوشتە بوو پیاوە ئەعرابیەکە بوو بە ئیسلام وە بانگەوازی ئیسلامەتی بۆ هۆز و کەس و کارەکەشی کرد.

حەز ناکەی خەڵك ئیسلامی خۆش بوێ...!!؟

ئەوا پێویستە خۆنەویست بیت.

## ناوەڕۆکی خۆنەویستن

یەکێك لە هاوەڵان دەڵێ: (پێغەمبەرﷺ ئەوەی لای بووە وەهەیبووە داویەتە خەڵکی هەرگیز هیچی بۆ خۆی نەگێڕاوەتەوە).

ئەی خودایە...!! کەسێك نەبووە شتێکی لە پێغەمبەرﷺ داوا نەکردبێت نەیدابێتێ.

کێ لە ئێمە ئەو جۆرە خۆنەویستنەی هەیە...؟ دەزانم ئێستا دەڵێن، ئاخر ئەو پێغەمبەرە چۆن ئێمە وەکو ئەو دەبین؟ ئێمە پێویستە پەیرەوی ئەو بکەین... سوێند بە خوا کەسی واتان لێ دەردەچێت کە هەر شتێکی هەبێت هیچی بۆ خۆی ناگێڕێتەوە هەمووی دەداتە خەڵکی...ئەوە لە خودا دوورنی یە.

## خوای گەورە لە چاکەی هەردووکتان ڕازی بوو...!!

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ گوتی: ئەی نێردراوی خوا من ماندوو و بێ تاقەتم (هیچ خواردنێ نییە بیخۆم)،

پێغەمبەرﷺ ئەو هەواڵەی گەیاندە خێزانەكانی فەرمووی: هیچ شتێكتان لایە؟ هەموویان یەك وەڵامیان لا بوو: (نا بەوەی تۆی ناردووە بە حەق لە ناو زیاتر چی ترمان نییە). پێغەمبەریشﷺ پیاوە برسییەكەی لەگەڵ خۆی برد چووە لای هاوەڵانی فەرمووی: (كێ ئەو پیاوە دەكاتە میوانی خۆی؟)، پیاوێك لە ئەنسارەكان یەكسەر هەڵسا گوتی: (من دەیكەمە میوانی خۆم ئەی پێغەمبەری خودا) ، ئیتر ئەو پیاوەكەی لەگەڵ خۆی بردەماڵەوەو بە خێرایی چووە لای خێزانەكەی پێی گوت: هیچ خواردنێكمان هەیە؟ گوتی: نەء تەنها قووتی منداڵەكانم نەبێ، پیاوەكەش گوتی: منداڵەكان بە شتێكەوە خەریك بكە ئەگەر داوای نانی ئێوارەیان كرد بیانخەوێنە ، تا میوانەكە دێت، ئەوجا خواردنەكە دانێ ، پاشان چراكە بكوژێنەوە تاكو هەست بەوە بكا كە ئێمە وا لەگەڵی دەخۆین... ئیتر میوان هات دانیشت و نانەكەی خوارد...كە كاتی نوێژی بەیانی هات ئەو خێرخوازە چوو بۆ مزگەوت لەوێ پێغەمبەری بینیﷺ كە پێی فەرموو: (خوای گەورە ڕازی بوو لەو چاكە و لەو شێوە مامەڵەكردنەی ئەو شەوەی ئێوە لەگەڵ میوانەكەتان)[1].

ئەمە سەركەوتنێ بوو كە شیاو و شایستەی ئەو خەڵاتە بوو كە پێیان بوترێ: (خودای گەورە ڕازی بوو لەو چاكە و لەو شێوە

[1] رواه البخاري في (الحديث، ٣٧٩٨) والبيهقي في "السنن الكبرى" (الحديث، ١٨٥/٤) بنحوه.

مامەڵەکردنەی ئەو شەوەی ئێوە لەگەڵ میوانەکەتان)...ئەی تۆش ناتەوێ خوا لێت ڕازی بێت؟ خۆ بارودۆخی ژیانت لەم هاوەڵە زۆر باشترە، وانییە؟ ئەی بۆ وا ناکەی!؟

## دیمەنێکی خراپ

سێ هاورێ لە گەشتێکدان، هەر یەکێکیان خۆراکێکی بۆ خۆی هەڵگرتووە و لەوی تری شاردۆتەوە، تاکو هیچی لێ نەبات بەڵکو لەتێکیشی لێ داوانەکات...!!

سوپاس و ستایش بۆ خوا بۆ ڕەوشتی خۆنەویستن...

## دروشمی خۆنەویستن

دروشمێکە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو موسڵمانێك دایرشتووە، دەفەرموێ ﷺ: (ئیمانی کەستان کامڵ نابێت هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت) [1].

وەك بڵێی دەفەرمووێ ﷺ ئیمانت تەواو نابێت بە خۆنەویستن نەبێ.

دەی تۆش ئێستا دەست پێ بکە ئەوە بکە بە دروشمی خۆت...

[1] رواه البخاری في (الحديث ١٣)، و مسلم في (الحديث ١٦٨) ، و الترمذي في (الحديث ٢٥١٥) ، و النسائي ( في الحديث ٥٠٣٦)، وابن ماجه في (الحديث ٦٦).

## پشتی لە ژووژک ئەچوو بەهۆی ئەو تیرانەی بەری کەوتبوو ...

باوکی دوجانە یەکێك بوو لە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) ئەو لە هێرشی بەدردا پێغەمبەری لا گرنگتر بوو لە گیانی خۆی...کاتێك بینی تیرەکان لە هەموو لایەکەوە بۆ پێغەمبەرﷺ دەهاوێـژرێ یەکسەر پێغەمبەری ﷺ گرتە باوەش و خۆی کرد بەسەریا ، واتە(خۆی کردە قەڵغانێك بۆ پاراستنی پێغەمبەرﷺ) لە ئەنجامدا هەموو تیرەکان بەر پشتی باوکی دوجانە کەوت...کە ئیمامی ئەبوبەکر ئەو دیمەنەی بینی گوتی؛ کە سەیری پشتی باوکی دوجانەم کرد وەك ژووژك وا بوو لەبەرئەو هەموو تیرەی بەر پشتی کەوتبوو.

ئەو گیانی خۆی نەویست و بەخشی بۆ خوا و پێغەمبەر...پشتی دەداتە بەر ئەو هەموو تیرە و بە سەختی بریندار دەبێ ئەویش لەبەر خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر ﷺ کە گیانی خۆی دەکاتە فیدای پێغەمبەر...

ئەی ئەمرۆ ئێمە چۆن خۆمان بکەینە فیدای خۆشەویستﷺ و لەبەر ئەو خۆمان نەوێت ...؟!

ئەمرۆ ئەگەر بمانەوێ پێغەمبەرﷺ بەسەر نەفس و گیانی خۆمانا پەسەند بکەین دەبێ سووننەتەکانی بپارێزین و پارێزگاری

بکەین، وە لە هەموو داب و نەریت و دەستوورەکانی تر بە چاکتری بزانین وە پەیڕەوی بکەین.

## ملم نەک ملت ئەی پێغەمبەری خودا

نموونەیەکی تری خۆنەویستن... طەڵحەی کوڕی عوبیداللەیە کە دەڵێ: سەرت بێنە خوارەوە تا تیرت بەر نەکەوێ ئەی پێغەمبەری خوا، ملی من نەك ملی تۆ ئەی پێغەمبەری خودا...لەوکات تیرێك بۆ پێغەمبەرﷺ دەهاوێژرێ طە لحە یەکسەر دەیبینێ و دەستی دەداتە بەری بۆئەوەی بەر پێغەمبەرﷺ نەکەوێ، لە ئاکامدا تیر دەچێتە ناو لەپی پاکی طە ڵحە و شەلەلی دەکات.

لەم هەڵوێستە...!! تیر بەرەو پێغەمبەرﷺ دێت طە لحە دەستی دەداتە بەری بەڵام لات سەیر نەبێ... گەر نەفسی خۆی کردە فیدای پێغەمبەرﷺ ئەوا دەست هەر زۆر ئاسانە... ئەی ئەو نەیگوت ملم نەك ملت ئەی پێغەمبەری خودا.

## خوایە تۆ شاهێدی کە یەزیدی کوڕی سوکەن پەیمانی خۆی بەجێ هێنا

پێغەمبەر لە ڕۆژی ئوحوددا دەوەستێت و دەفەرموێ: (کێ نەفسی و گیانی خۆی پێمان دەفرۆشێ) یەکسەر دە گەنجی ئەنساری دێنە پێشەوە ( کە تەمەنیان لە نێوان١٨-١٩ ساڵدا بوو) ئیتر یەك لە دوای یەك شەهید دەبن، یەکەم پاشان دووەم پاشان سێ یەم، دواتر

هەر دەیان شەهید دەبن کە دەیەمیان (یەزیدی کوڕی سوکەن)ە کە بەرگری لە پێغەمبەرﷺ دەکات وە بە برینداری دەکەوێتە سەر پێی پێغەمبەرﷺ ئینجا دەمرێ، پێغەمبەریش دەفەرموێ ﷺ: (خوایە تۆ شاهێد کە یەزیدی کوڕی سوکەن پەیمانی خۆی بەجێ هێنا)، ئەمەش ( إبن هشام ) لە ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ باسی لێوە دەکات.

ئەوەیە کە خۆت نەوێت پێغەمبەرت بوێتﷺ.

ئەی گەنجان... ئەی ئەوانەی لە تەمەنی یەزیدی کوڕی سوکەنن...ئایا ئێوە پێغەمبەرتان ﷺ خۆش ناوێت؟ گەر خۆشتان دەوێ سوننەتەکانی بپارێزن و پەیرەوی بکەن...توخوا لە مژدەبەخشەکان بن نەك لە ڕۆچووەکان...!!

## گەورەترین خۆنەویستن

بە پێداچوونەوەیەکی ئەم نموونانەی پێشوو لە خۆنەویستن...سەیر دەکەین گشتی باس لە خۆنەویستنی تاکە کەسێکە دەکات... بەڵام هەرگیز گوێبیستی خۆنەویستنی تەواوی وولاتێك وتەواوی نیشتمانێك نەبوویتە...کە ئەوەش گەورەترین خۆنەویستنە...

کـاتی کۆچـکردنی موسـوڵمانان لـە مەککـەوە بـۆ مەدینـە ، هەڵوێـستی ئەنـسارەکانی مەدینـە بـۆ بـرا کۆچـەرەکان جێگـای سەرسوڕمان بوو کە نە وەسف دەکرێ ، نە دەزانی چۆن باسی بکەی.

هەر کۆچەرێك جگە لەو جلانەی کە لـە بەریـەتی چی تـری نەبوو، لەگەڵ ئەوەی ئەوان لە مەککە دەوڵەمەند بوون...

ناسراویشە کە خەڵکی مەدینە خـەڵکێکی کشتوکاڵی بـوون و خەڵکی مەککەش بازرگان بوون.

خۆنەویستنی ئەنسارەکان شتێکی خـەیاڵی بـوو عـەقڵ بـڕوای پێ ناکا...خۆنەویستنێکی سەرسوڕهێنەر بوو.

هەر کۆچەرێك بە تیرو پشك نەبوایە نەدەچووە مـاڵی بـرا ئەنـساری یەکـەی... وە ئەگـەر بگوترابـا فـلان دادەبەزێتـە مـاڵی کـێ؟ هـەموو ئەنسارەکان بە یەکەوە دەیانگوت؛ بۆ لای من، بۆلای من... ئـەوە چـی یە؟! ئەو ج خۆنەویستنێکە ؟!

ئاخر ماقوڵ نی یە...!! ئاخر هیچ پەیوەندییەکی خزمایەتی ودۆسـتایەتی لـە نێوانیانـا نـەبوو ، مەگـەر لەبـەر برایـەتی ئیـسلامی نەبێ خۆ هەر یەکتریشیان نەدەناسی...

**هەر لە ئێستاوە نابێ ئەم دیمەنە ببینین... !!**

سەیردەکەی دایکەکە تەمەنی گەورە بووە و ناتوانێ بە تەنها بژی، هیچ لە کوڕەکانیشی هەست بە لێپرسینەوە ناکەن هەریەك بەوی تر دەڵێ: بیبە بۆ لای خۆت... بۆ ئەوەی لەم کارە ڕابکەن.

دایکە وا ڕاهاتووە کە چەند کاتێك یاخود چەند ڕۆژێك لە ماڵی کوڕەکەی بێت... ژنی کوڕەش لەگەڵی دڵ فراوان نی یە و ڕایناگرێت.

دە لە خۆنەویستنی ئەنسارەکان فێر بن.

**چاو تێری و دڵ تێری ئەنسارەکان**

**وە پاکی و بێگەردی کۆچەرەکان**

ئێستا نموونەیەك لە خۆنەویستنی ئەنسارەکان بۆ کۆچەرەکان باس دەکەین ئەویش نموونەی سەعد کوڕی ئەلربیع و عبدالرحمانی کوڕی عەوفە ،جا تکایە ئەم چەند ڕستەیەی خوارەوە پڕ بە دڵ بخوێنەوە... سەعد کوڕی ئەلربیعی ئەنساری گوتی: براکەم ئەوە هەموو پارەکانمە کۆمکردۆتەوە بیکە بە دوو بەشی یەکسان، وە ئەوەش ماڵەکەمە نیوەی بۆ من نیوەی بۆ تۆ، دوو ژنیشم هەیە هەردووکیانت پێشان دەدەم وە تۆش سەیریان دەکەیت کامیانت زیاتر بەدڵ بوو تەلاقی دەدەم هەتا دەگاتە کاتی دیاری کراوی تەلاقەکە ئینجا مارەی بکە و بیهێنە!! عبدالرحمنی کوڕی عەوفیش چی

نەگوت تەنها ئەوەندە نەبێ: خودا جەزای خێرت داتەوە، کوا بازار؟ بازارم پێ نیشان دە.

ئەوە چی یە...!؟ سوێند بە خوا ئەم نموونەیە بەسە بۆ تۆ...!! ئایا خەیاڵی ئەوە دەکەی کە بتوانی هەموو پارە و سامانت بێنی بیانکەی بە دوو بەشی یەکسان... ماڵەکەشت دابەش بکەیتە دوو بەشی یەکسان لە نێوان خۆت و براکەت وە هەروەها ژنەکانیشت...!!

وابزانم هەندێك لە ژنان ئەو قسانەیان بەدڵ نەبوو...!؟

ئێستا بە بیرت دێنمەوە لە چ وێستگەیەکی؟!

هەروا بە ڕێگاوەین بەرەو وێسگەی سەرەکی...

**گەورەترین کۆچکردن لە مێژوودا**

هیچ کۆچکردنێك لە مێژوودا نەبووە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر بە پەلاماردان وخوێن ڕشتن نەبێ...بۆ نموونە کۆچڕەوی ئەورووپیەکان بۆ ئەمریکا کە لە فیلمەکانا بینیمان...چەند لە هندییە سوورەکان کوژران... چەند خوێن ڕژا بۆ ئەوەی ئەمەریکا بۆ ئەوروپی یەکان بێت...

بەڵام گەورەترین کۆچکردن لە مێژوودا، کۆچکردنی کۆچەرەکانی مەککە بوون بۆ مەدینەی منەوەرە، چونکە لە پێناوی ئیسلام بوو...کە گشتی خۆشەویستی و خۆنەویستن بوو.

تۆش ناتەویَ بچیتە ڕیزی ئەوانـەوە وە نموونـەی وەك ئـەوان بیت...؟ دەی هەر ئێستا سەر لە نویَ دەست پیَ بکە و هـەموو ژیانـت بکە بە خۆنەویستن...ئایا دەتوانیت...؟!!

## شوێنەوار و ڕەنگدانەوەی خۆنەویستن

شـــوێنەوار و ڕەنگدانــەوەی خۆنەویــستن گــشتی خێــر و بەرەکەتـە... خـوا لێـت ڕازی دەبێـت وە بـۆت زیـاد دەکـات...ئـەوەش بزانە کە ئەگەر دەستت گرت و داتخست ئەوە لە جیاتی خۆنەویستن خۆت پەسند دەکەیت بەسـەر خـەڵکی تـر و خـۆت زیـاتر دەوێـت لـە کەسانی تر.

بانگـەوازێکی بـە پەلـە... بـۆ هـەموو کـچان و کـوڕان... بـۆ هەموو ئافرەتان و پیاوان...

(هەڵسن دۆلابی شتوومەکەکانتان بکەنەوە...ئەو جلانـەی کـە ســـاڵێك دوو ســـاڵی بەســـەردا تێپـــەڕیوە وە کەســـیش لەبـــەری نەکردووە...کوا خۆنەویستنتان...نەفسی خۆتان پڕ بکـەن لـە خێـر و پیـشان خـوای بـدەن...ئـەوەش بـزانن کـە ئـەو شـتانەی پێغەمبـەر دەیبەخشیﷺ هەرهەمووی نویَ بوون).

دەی تۆش خۆنەویست بە ، بە شتومەکە کۆنەکانت دەست پیَ بکە...

لەگەڵ شتی ترمە بێجگە لەوانە...!!

ئـــەم چـــەند ڕســـتەیەی خـــوارەوە بخوێنـــەوە و ســـەرت سوڕنەمێنێ...كە ئەوپەڕی خۆنەویستنە...

پێغەمبەر ﷺ بە ئەنسارەكانی گوت: برا كۆچەرەكانتان پارەو سەروەت و سامان و منداڵەكانیان جێهێشتووە و هاتوونەتە لای ئێوە كشتوكاڵیش نازانن دەی دابەشیان ناكەن؟) گوتیان بەڵێ باشە ئەی پێغەمبەری خودا پارە و پولمان لە نێوان خۆمان و ئەوان دابەش دەكەین، پێغەمبەریش ﷺ پێیانی فەرموو: ( لەگەڵ شتی ترمە بێجگە لەوانە؟) گوتیان: جگە لەوانە چیتر هەیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ گوتی: (بەروبوومەكانتان لەگەڵیان دابەش بكەن) گوتیان: بەڵێ باشە ئەی پێغەمبەری خودا، بەڵام بەرامبەر بەچی ؟ فەرمووی ﷺ: (بەرامبەر بە بەهەشت كە بۆ ئێومیە)[1]

پاكی و بێگەردی بۆ خوا... كۆچەرەكان لە مەدینە ناتوانن دەرچن بۆ بازرگانی، چونكە (لەبەرئەوەی سروشتی جوگرافیای مەدینە وایە كە لە سێ لاوە دەورەدراوە وە هاتووچۆكردن بۆی سەختە و ناكرێ) كەوایە ئەو پارەیەی ئەنسارەكان لەگەڵیانا دابەشیان كردووە بە كەڵكیان نایەت و سوودی لێ وەرناگرن...بەڵام سەیری خۆنەویستنی ئەنسارەكان بكە كە نە سنووری هەیە و نە

---

[1] رواه البخاري في(الحديث:٣٧٨٢) بنحوه.

کۆتـایی دێـت، ئـەی چـۆن ئـاوا نابێـت بەهەشـت جـەزا و پاداشـتیان بێت؟

## حەز دەکەی ببیتە کامەیان... !؟

هەر پیاوێکی ئەنساری یەك ساڵی تەواو لە زەوی خۆی ئیـشی دەکرد پاشان کۆی بەروبوومی ئەو ساڵەی کە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە ماڵی خـۆی دەیـبردە مـاڵی بـرا کۆچـەرەکەی و پـیٚ ی دەگـوت: مـاوەی یــەك کاتــژمێر مــن بــەجێت دێڵــم، تــۆش بــە هەوەســی خــۆت هەڵیبژێرە...

ئەوە چ خوڕەوشت و ڕەفتارێکە...!؟

## چەند دیمەنێک

دینارێکی چڵکن لە گیرفانتایە نـازانی چـۆن خـۆتی لـێ ڕزگـار بکەیت...ناچاری دەیبەخشی...!

شەش جلت کڕیوە، پـێش ئـەوەی بـچیتە لای هاوڕێکەت لـەو شەشــە جــوانترین و باشــترین و کەشــخەترین جــل هەڵدەبــژێری وە ئەوەی لەبەرت ماوەتەوە دەیبەیت بۆ هاوڕێکەت...!!

## مەرجت لەسەرمان دانا ئێمەش
## جێبەجێمان کرد

پێغەمبــەرﷺ دوای ســەرکەوتن و کردنــەوەی خەیبــەر بــە ئەنسارەکانی گوت: (خودا پاداشتی خێرتان داتـەوە کـە پـەیمانتان بـە

جێ هێناو وەفاداربوون...) ئەوانیش گوتیان: مەرجێکت لەسەرمان دانا و مەرجێکمان لەسەرت دانا ئەو مەرجەی لەسەرمانت دانا جێبە جێمان کرد و وەفاداربووین، ئێمەش مەرجمان هەیە لای تۆ کە بەهەشتە

فەرمووی: (بەهەشت بۆ ئێوەیە بەرامبەر بەوەی کە بەوەفابوون)[1].

ئەی ئێوە تامەزرۆی بەهەشت نین...؟!

## خۆنەویستن نەخۆشیەکانی دڵ چارەسەر دەکات

ئەگەر خۆنەویست بیت ئەوا خێر و بەخشندەیەکی زۆر دەدۆزیتەوە...دڵ تێرتر و چاو تێرتر دەبیت...هەر چ ڕق و قینە و بوغز و حەسودی‌یە هەر هەمووی لە دڵتا دێتە دەرەوە...

پەیوەندیەکی سەیر لە نێوان خۆنەویستن وە ساغ و سەلامەتی دڵدا هەیە...وە لە نێوان خۆنەویستن و بەزەیی... وە لە نێوان خۆنەویستن و سینە ساف... وە لە نێوان خۆنەویستن و...وە هەروەها...

گەر دەتەوێت سینەت بێ گەرد و بێ خەوش بێت ئەوا فێری خۆنەویستن بە.

## مەدینەی چاکەکار...

## خەونێکی لەبارە بۆ بەدی هێنان

[1] رواه الطبراني في "المعجم الكبير" (الحديث، ١٠١/٥).

هەتا ئەو كاتەی پارەیەكی زۆر لە بەحرەینەوە هات ئەوسا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (ئەوە بەتەنها بۆ ئەنسارەكانە) ئەنسارەكانیش هاتن و گوتیان: ئێمە نایبەین ئەی پێغەمبەری خوا هەتا دابەشی نەكەیت لە نێوان ئێمە و برا كۆچەرەكانمان، كۆچەرەكانیش هاتنە لای پێغەمبەرﷺ و گوتیان: ئەی نێردراوی خودا هیچ گەل و هۆزێكمان نەبینیوە ئەوەندە ماندوو بێت و ئەوەندە ببەخشێت وە باشتر و چاكتر بێت لەم گەلّ و هۆزەی كە لایان دابەزینە (مەبەستیان ئەنسارەكان بوو)، ئەوان سكیان تێر كردین، لە بەروبوومی پیشەیاندا هاوبەشیان كردین هەتا لەوە ترساین هەر هەموو ئەجر و پاداشتەكان ئەوان لای خوا وەریگرن ئەویش فەرموویﷺ: (نەخێر ئەو نزا و دوعایانەی بۆ ئەوانتان كردووە لای خوا نووسراوە و بۆ ئەوانە وە هەروەها سوپاس و ستایشكردنی ئێوەش بۆ ئەوانە) [١]

ئەوە چی یە...؟ ئەوە چ كۆمەڵگایەكن...؟

ئەی ئەوەی وا لە شاری چاكەكاران دەگەڕێ... ئەم خەونانە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەكانی بەدی هاتووە...بەڵام دڵنیا بە كە دووبارە دێتەوە دی ئەگەر هاتوو ئیمان بگەڕێتەوە ناو دڵەكان

---

[١] رواه أبوداود في الحديث (٤٨١٢) ، والترمذي في الحديث (٢٤٨٧).

و خۆنەویستن بگەڕێتەوە و بەهەشت ببێتە هیوا و ئاواتی سەرەکی هەر هەمووومان.

## بە خوا ئاو ناخۆمەوە
## تا براکەم ئاو نەخواتەوە...!!

عکریمە کوڕی ئەبو جەهل ۲۲ ساڵ دژایەتی پێغەمبەری ﷺ کرد و شەڕی لەگەڵدا کرد پاشان بوو بە ئیسلام و خۆی چاك کرد وە بە شەهیدی مرد ، هۆی شەهید بوونیشی ڕەوشتی خۆنەویستن بوو.

چۆن شەهید بووی ئەی عکریمە...؟

لە ڕۆژی شەڕی یەرموك موسوڵمانان بریندارەکانیان نزیك خۆیان دانابوو، بەڵام لە کاتی توندی شەڕەکە ئەو بریندارانە لەبیر کران، لە نێوان بریندارەکاندا عکرمەی کوڕی ئەبو جەهل بوو، لەو کاتەی کوڕە مامەکەی بەسەریانا دەگەڕا و یەك یەك ئاوی دەدانێ ، جا ئەو کوڕە مامەی دەگێڕێتەوە ودەڵێ: لە عکریمەی کوڕی مامم گەڕام لە نێوان بریندارەکاندا دۆزیمەوە ، بینیم زۆر شەکەت و بە ئازار بوو، ئەو زۆر زۆری تێنوو بوو، وە دە برینداری تریش لە تەنیشتی یەوە بوون ، منیش یەکسەر ئاوەکەم برد وە بۆلای عکرمە ڕام کرد و پێم گوت، بخۆوە، گوتی: باش، ئاوەکەی لێم وەرگرت هەر کە ویستی ئاوەکە بخواتەوە گوێی لە برا بریندارەکەی تەنیشتیەوە بوو دەیگوت: ئاه، ئاوی دەوویست یەکسەر عکریمە گوتی: بە خوا ئاو

ناخۆمەوە تا براکەم ئاو نەخواتەوە، ئینجا چوون ئاویان لای و ئاویان دایێ ، ئیتر ئەمە ڕووداوە لەگەڵ هەر دە برینداەرکە دووبارە بۆوە هەتا گەیشتنە دەیەم کەس ئەویش گوتی: بە خوا ئاو ناخۆمەوە تا عکریمە نەیخواتەوە، هەر کە ئەوانیش گەڕانەوە لای عکریمە، سەیر دەکەن مردووە و شەهید بووە...

شەرمت بە خۆت نی یە...چاوچنۆکی بۆ ١٠٠٠ دیناری بلیمەر... چاوچنۆکی بۆ شتومەکە کۆنەکانت... ناتەوێ هیچ زانیارییەك بدەیتە هاوڕێ هاوپیشەکانت.

ئایا ئەم هەڵوێستە هیچ کاریگەرییەکی لەسەرت نەبوو...؟

بەڵام من حەزم لە ماسی یە...!!

الهندی لە (گەنجینەی کرێکاران) دا باس لەم ڕووداوەی خوارەوە دەکات... کە هەڵوێستێکە بەشەو بەڕۆژ دووچاری دەبینەوە.

ڕۆژێك عەبدولای کوڕی عومەر تامەزرۆی ماسی بوو، ئەو حەزی لە ماسی برژاو دەکرد... ڕۆژێك خێزانەکەی ماسییەکی کڕی و بردییەوە ماڵەوە و برژاندی و لە بەردەم عەبدولای دانا...هەر ئەو کات هەژارێك لە دەرگای دا عەبدولا گوتی: ماسییەکەی بدەرێ، خێزانەکەشی گوتی: لە ماڵەوە گۆشتمان هەیە لەوانەیە ئەو هەژارە گۆشتەکەی پتر بوێ گوتی: ئاخر من حەزم لە ماسی یە! ئیتر ماسی یەکەی دا بە هەژارەکە و هەژار چووە دەرەوە، ئافرەتەکەش یەکسەر

بەدوایدا چووە دەرەوە و گوتی: ڕازی بە درهەمێك لێت بکڕمەوە، هەژارەکە ووتی: باشە ، ڕازیم، ئیتر لێی کڕیەوە و گەڕایەوە ماڵەوە دووبارە ماسی یەکەی لە بەردەم عەبدولاّ دانا، کاتێك ویستی ماسی‌یەکە بخوات هەژارەکە لەبەردەم دەرگا وەستا بوو، ژنە پێی ووت: چیت دەوێت؟ عەبدولاّش ووتی: ماسی یەکەی بدەرێ، دیسان هەمان ڕووداوی پێشوو ڕوویدا و ماسی یەکەی بە درهەمێکی تر لێ کڕیەوە، ئینجا ماسی یەکەی لە بەردەم عەبدولاّ دانایەوە ، هەژارەکە بۆ جاری سێیەم هاتەوە، ئەوجا ژنە ووتی: توخوا نەیەیتەوە ،عەبدولاّی کوڕی عومەریش ووتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو کە دەفەرموێ: ((هەر کەسێك دڵی بۆ شتێك چوو (شتی حەلالی ڕێ پێدراو) وە ئەو شتەی نەویست و دای بە کەسێکی تر کە بە خۆشی حەزی لێبوو ئەوا هەر خوا لێ ی خۆش دەبێت)).

خۆ عەیب نی یە دڵت بچێتە شتێکی حەلال، زۆریش ئاسایی‌یە دەستت بکەوێ، بۆ نموونە عەبدولاّی کوڕی عومەر دڵی چووە ماسی و خێزانەکەی بۆی کڕی... زانراوە مەدینە شارێکی کەنار دەریا نی یە واتە دەستکەوتنی ماسی لەم شارەدا ئاسان نی یە...

پاکی و بێگەردی بۆ خوا !! ماسی‌یەکت لەو شوێنە دەست بکەوێت و نەتەوێت ،جا بیدەی بە کەسێکی تر نە جارێك و نە دووان...

عەبدوڵا ووتی: (بەڵام من حەزم لە ماسی یە)... ئەو ڕستەیە مانای ئەوەیە کە (حەزم لەچ شتێك بێت ئەو دەبەخشم)...خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾[1]

واتە: ( ئێوە هەرگیز ناگەنە پلەی چاکی و چاکەکاری هەتا لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێت نەبەخشن).

**پ/ ئایا چاکترین و خۆشەویسترین شت لە لات چی یە؟**

ئایا دەتوانی ئەو شتەت بۆ خۆت نەوێ و بیدەی بە کەسێکی تر تا خوا لێت خۆش بێت؟!

**ئەو شوێنەم بۆ خۆم دانابوو**

**بەڵام دەیدەم بە عومەر بێ**

نموونەیەکی تری خۆنەویستن...هەڵوێستی خاتوو عائشەیە...کە ئەبو لولوی مەجوسی لە خەلیفە عومەری کوڕی خەتابی دا، ئیمامی عومەر یەکسەر کەوت ولە خوێنی خۆی گەوزا ، ئەوسا عومەر زانی کە دەمرێت ، بە کوڕەکەی گوت: عبدالله بچۆ بۆ لای عائیشەی دایکی ئیمانداران و پێ ی بڵێ:

عومەری کوڕی خەتاب ڕووخسەتت لێ دەخوازێ کە لە تەنیشت هەردوو هاوەڵەکەی بشاردرێتەوە (لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و

[1] سورة آل عمران: ٩٢.

ئەبوبەکری بوو)، خاتوو عائشەش گوتی: ئەو شوێنەم بۆ خۆم دانابوو بەڵام با بۆ عومەر بێ.

**خوات لێ ڕازی بێت ئەی ئەبوو هورەیرە**

پێغەمبەرﷺ بەم هەڵوێستە جوانەی خوارەوە ئێمەو باوکی هورەیرە فێری خۆنەویستن دەکات...باوکی هورەیرە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە دەڵێ: زۆر زۆرم برسی بوو لە تاو توندی برسێتی پێیان دەوتم، ئەوە شێت بووە، دەمگوت: بە خوا شێت نیم، ئەوە برسێتی یە برسێتی، ئینجا دەچووم لە تەنیشت دوانگەی پێغەمبەرﷺ دادەنیشتم جا هەر پیاوێکی موسوڵمان بە لاما تێپەربووایە یەکسەر ئایاتی بژێوی و بەخشینم بۆ دەخوێندەوە (هەتا دڵی نەرم بێتەوە هەست بە من بکا و شتێکم پێ ببەخشێ)، ئەبوبەکر هات بەلاما تێپەری و ئایەتەکەم خوێندەوە ، ئیتر ئەو ڕۆیشت و گرنگی پێم نەدا ئینجا عومەر بە لاما تێپەڕی ئەویش گرنگی نەدا و ڕۆیشت، پاشان پێغەمبەرﷺ تێپەڕی و سەیری کردم زانی حاڵم چۆنە، زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووویﷺ: ئەی باوکی هورەیرە لەگەڵم وەرە و شوێنم کەوە منیش شوێنی کەوتم تا گەیشتەوە ماڵی خۆیﷺ ئینجا ڕوخسەتی هاتنە ژوورەوەم خواست، ئەویش بە خێزانەکەی فەرمووﷺ: هیچمان هەیە؟ گوتی:جەڕە شیرێك کە بەشی یەك کەس یان دوو کەس دەکات (ئای لەو خۆشییەی ئەی

باوكى هورِميرِه) ئينجا پێغەمبەرﷺپێى ووتم: ((ئەى باوكى هورِميرِه بچۆ كەسان و ئەهلى (سيفەم) بۆ بانگ كە و لەگەڵ خۆت بيانهێنە))، (كەسانى سيفە موسوڵمانە هەژارەكان بوون كە ژمارەيان نزيكەى ١٠٠ كەس دەبوو)، هەر يەكسەر داخ كەوتە دڵمەوەو غەمم خوارد لە دڵەوە گوتم: كوا ئەو گۆزەيە بەشى كەسانى سيفە دەكات، ئەوە لە كێ ئەوان لە كێ؟ بەڵام هەر دەبوايە گوێڕايەڵى پێغەمبەرى خودا بم، ئيدى ڕۆيشتم و ئەوانم هێنا، پێغەمبەرﷺ بە خەنديەك سەيرى كردم و پێى گوتم: (جەڕە شيرەكە بەسەرياندا بگێڕە) منيش ناچار گۆزەم هەڵگرت و يەكە يەكە شيرەكەم بەسەريانا گێڕا، ئەوانيش هەر لێيان دەخواردەوە هەتا تێر دەبوون، من هەر دەمگوت: تياى نەما، هيچى تيا نەما، ئيدى هەر جارەو يەكێك لێى وەردەگرتم و شيرى دەخواردەوە هەتا تێردەبوو ئيتر ئاوا...تا هەر هەموويان تێريان شير خواردەوە، پێغەمبەريشﷺ هەر بە زەردەخەنەوە سەيرى دەكردم، ئينجا فەرمووىﷺ: (ئەى باوكى هورِميرِه جگە لە من و تۆ كەسى تر نەما)، گوتم: ڕاستت فەرموو ئەى پێغەمبەرى خوا فەرمووىﷺ: (دە بخۆوە باوكى هورِميرِه) (ئێ هيچ ماوە پاش ئەو هەمووە...؟) ئينجا خواردمەوە و پاشان دام بەو فەرمووىﷺ: (بخۆوە باوكى هورِميرِه) منيش دووبارە شيرم خواردەوە، پاشان دام بەو، فەرمووىﷺ:(بخۆوە باوكى هورِميرِه) سێ بارە خواردمەوەئەو هەر دەيگوتەوەﷺ : (بخۆوە، بخۆوە)، منيش هەر دەمخواردەوە تاكو

گوتم: نا بەوەی تۆی بە حەق ناردووە بەسە، هیچ جێگایەکی بۆ نەما ئاخر بیخەمە کوێ؟ (ئەوەندە تێر بوو بوو). دواتر پێغەمبەرﷺ جەرە شیرەکەی وەرگرت و لێی خواردەوە[1].

ئەوە موعجیزەیەك بوو لە موعجیزەکانی پێغەمبەرﷺ، بۆ ئەوەی باوکی هورەیرە و هەموو موسوڵمانان فێری ئەم جۆرە رەوشتە بکات(رەوشتیخۆنەویستن) وە تا رۆژی دوایی.

لە رەوشتی خۆنەویستندا خێر و بەرەکەت و زیاد بوونێك هەیە، ئەگەر کەمێ خواردنت لابوو بیدەی بە کەسێکی تر بە ویستی خودا زیاد دەبێت... دەی سووتەمەنیەکەت نوێ بکەوە...

ئەی بیرت ماوە شەمەندەفەرەکەت گەیشتە کام وێستگە؟

## تام و لەززەتی خۆنەویستن بچێژە

خۆنەویستن خۆشی و لەززەتێکی هەیە کە وەسف ناکرێ...دڵێکی بێ خەوش و نەفسێکی پاکت پێ دەبەخشێت... خۆنەویستن هەست و سۆزە مرۆڤایەتیەکان بە رادەیەك بەرز دەکاتەوە تا وات لێ دێت کە هەر کاتێك حەزت لە هەر شتێکی حەلال بوو یەکسەر دەیبەخشی و دەیدەیتە یەکێکی تر، وە کە ئەو وەریگرت و دڵی ئەوت خۆش کرد ، ئەوا بێگومان لەززەتی ئەو

[1] رواه البخاري في ( الحديث،٦٤٥٢) ، والترمذي في ( الحديث،٢٤٧٧).

خۆشییەی ئەو لەناو دڵی خۆتا ئەدۆزیتەوە، بەڵێ ، بە ڕاستی ئەو هەستەت پێ دەبەخشێ...وە ئەو خواردنەی کە حەزت لێ یەتی نەتخوارد و دات بە کەسێکی تر ئەوا تام و چێژی ئەو خواردنە لە دەمی خۆتا دەدۆزیتەوە.

دەی گەنجان...هەر ئێستا چاوچنۆکی لە دڵتانا دەربێنن...دەست پێ بکەن و خۆتان ڕابێنن...

هەر شتێك کە خۆت حەزت لێ یەتی نەتویست و توانیت بەسەر نەفسی خۆتا زاڵ بیت و بەخشیت (جا ئەگەر ئەو شتە بچوك بێت یا گەورە) ئەوا بێگومان دەبیتە مرۆڤێك کە هەمیشە حەزی لە چاکە و خێرە... بەڵکو عەشقی خێر و چاکەکردن دەبیت...دەگۆڕێی بۆ مرۆڤێك کە بەدوای خۆنەویستنا بگەڕێت لە هەموو شوێنێك ولە هەموو کاتێك، بۆ نموونە؛

- لە ناو ئۆتومبیلەکانی هاتووچۆ کە زۆر ماندوویت بەڵام زۆر بە ئاسانی بۆ پیاوێکی بە تەمەن یان بۆ

ئافرەتێك هەڵدەستیتەوە.

ئەگەر لە نێوان دوو شتی باش و باشتر هەڵبژێردرای... باشەکە بۆ خۆت و باشترەکە بۆ براکەت بەجێ دێڵی... دەی تاقی بکەوە.

## موعجیزەیەک

## بۆ فێر بوونی خۆنەویستن... !!

هاوەڵان بۆ لێدانی کەندەر (خەندەق) ماوەی ١٥ڕۆژ مانەوە ، ئەوەندە برسی بوون لە تاو برسێتی بەردیان لە سکیان بەستبۆوە، جابری کوڕی عبداللە هات بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە ماڵەوە مریشکێك و کەمێك جۆمان هەیە ، بە پێشم کەوە ئەی پێغەمبەری خودا تا بەیەکەوە بیخۆین ، پێغەمبەریش ﷺ سەیرێکی جابری کرد و فەرمووی: (بە تەنها من بێم؟) جابریش گوتی: یا یەکێك یان دووان لەگەڵتا بێت، ئیدی پێغەمبەر چووە سەر بەرزایی چیایەك وەستا و فەرمووی ﷺ: (ئەی دەستە لەشکری کۆچەرەکان، ئەی دەستە لەشکری ئەنسارەکان، ژەمی ئەمڕۆمان لای جابری کوڕی عبداللەیە) جابریش گوتی: هەر کە پێغەمبەر وای ووت یەکسەر خۆم دزییەوە و بەخێرایی ڕامکردە ماڵەوە و خۆم گەیاندە خێزانەکەم و پێم گوت: فریامکەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆو بە هەموو لەشکرەوە بەرەو ئێرە دێن...!! ئەو ئافرەتە موسڵمانە بڕوادارە وتی: بڕی خواردنەکەت بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاند؟ گوتی: بەڵێ، ئەویش گوتی: خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆیان باشتر دەزانن، پێغەمبەری خودا ﷺ پێش گەیشتنی سوپاکە هاتە لای جابر و پێ ی فەرموو: (جابر

تۆ ئەمرۆ دەرگەوانمانی)... پێغەمبەریش ﷺ نانی ئامادە دەكرد، وە هەرجارێ جابر ١٠ كەسی دەهێنا ژوورەوە خواردنەكەی بەسەریانا دابەش دەكرد ، ئەوانیش دەیانخوارد و پاشان دەچوونە دەرەوە ، ئیدی ١٠ دەهاتنە ژوورەوە ١٠ دەچوونە دەرەوە...وە هەروەها...، تا هەر هەموو لەشكرەكە لە تێری نانیان خوارد ئەوجا جابر چووە ژوورەوە. جابر دەڵێ: هەر كاتێك كۆمەڵێك دەردەچوون دەمگوت بەشی دەستەی پاش ئەوان ناكات ئەوجا دەچوونە ژوورەوە تێریان دەخوارد ،كە دەهاتنە دەرەوەش گەدە و سكیان پڕ ببوو و ددانیان پاك دەكردەوە، پاشان دەڵێ: پێغەمبەرﷺ پێ ی ووتم: (ئەی جابر خوای گەورە بەرەكەتی خۆی خستە ناو خواردنەكەی تۆ و خێزانەكەت) جا كە چوومە ژوورەوە سەیری خواردنەكەم كرد دەبینم وەك خۆی ماوە تەنها پارچەیەك لە مریشكەكە نەبێت كەمی كردبوو...ئەی خوایە... شتێكی دەرئاسا... موعجیزەیەك...سوپایەك بەتەواوی تێریان نان خوارد.ئایا فێر نەبووی...؟!

## میللەتێک کە خۆنەویستنی تیا نەما.....!!

پاش ئەوەی جەعفەری كوڕی باوكی تاڵیب لە ڕۆژی موئتەدا شەهید كرا ، سێ منداڵی بچووكی لە دوای خۆی بەجێ هێشت، پێغەمبەریشﷺ هەڵسا لەناو خەڵكی بانگەوازی كرد و فەرمووی:

(كێ منداڵەكانی جەعفەر دەگرێتە ئەستۆی خۆی؟) ،(كێ بەخێویان دەكات؟)

هەر یەكسەر سێ لە هاوەڵان هەڵسان و كەوتنە پێشبڕكێی یەكتر بۆ وەرگرتنی ئەو سێ منداڵەی جەعفەر (هەرچەندە گشتیان هەژار ونەبوون و بێ تاقەت بوون)...جەعفەری كوڕی باوكی تاڵیب پیاوێكی زۆر خۆنەویست بوو هەتا پێغەمبەرﷺ ناوی نابوو؛ باوكی هەژاران، كە ئەم ڕەوشتەی دوای مردن بە كەڵكی هات...

بەڵام لەم ڕۆژگارەدا... ئاخ و داخ بۆ میللەتێك ڕەوشتی خۆنەویستنی تیا وون بووە و نەماوە...

كوڕ پاش مردنی باوك كەس نی یە بیگرێتە ئەستۆی خۆی مامەكانیشی لە هەڵگرتنی ئەو بارە قورسە ڕادەكەن.

## خۆنەویستن نەبێ

## نە دڵنیایی نە حەوانەوە هەیە

ئەگەر سەرنج بدەینە واقیعی ئەمرۆمان... سەیر دەكەی ئەوە باوكە وا بە شەو بە ڕۆژ ئیش دەكات، ئەوەش دایكە وا بە شەو بە ڕۆژ ئیش دەكات ، ئەوە هەمووی تاوەكو ژیانێكی ئاسوودە و خۆش بۆ منداڵەكانیان دابین بكەن، جا ئەوەندە دڵیان لای منداڵەكانیانە كە هەر دەڵێن و دەڵێنەوە؛ ئاه نازانین دونیا چی بۆیان هەڵگرتووە...نازانین بەیانی چی بۆیان شادۆتەوە...

توخوا...گەر کۆمەڵگایەك ڕەوشتی خۆنەویستنی تێدا بەربلاو و باو بوو... دەگاتە ئەو ڕادەیە من ئەوەندە لە داهاتووی منداڵەکانم بترسم؟... نەخێر گەر خۆنەویست بم دەزانم ودڵنیام کە لە دوای من کۆمەڵگا گرنگییان پێدەدات وە کەسێك هەر دەبێ ئاگای لە منداڵەکانم بێت و بەخێویان بکات...مەحاڵە کۆمەڵگاش هەست بە ئاسوودەیی و دڵنیایی و حەوانەوە بکات مەگەر بە ڕەوشتی خۆنەویستن نەبێ...

دەی دڵەکان نەهەژان...؟ فرمێسکەکان نەرژان...؟! ئەی کۆمەڵگای خۆت خۆشناوێت...؟! دە لە خۆتەوە دەست پێ بکە.

## لەوانە بوونەوەر بە کەڵک بوونەوەر بێت

ئیمامی غەزالی لە کتێبی (احیاء علوم الدین) سەبارەت بە ڕەوشتی خۆنەویستن دەڵێ: ئاستی خۆنەویستن دەگۆڕێ لەم سێ پلە و پایەی خوارەوە:

یەکەمیان: خەڵك دێنیتە ئاستی خزمەتکار کە ئەوەی لەبەرت ماوەتەوە دەیدەیتێ.

دووەمیان: خەڵك دێنیتە ئاستی خۆت کە چیت بۆ خۆت بوێ ئەوەشت بۆ ئەو دەوێ (ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە و وەری دەگری بۆ خەڵکیش پێت خۆشە ودەیبەخشی).

سێیەمیان: خەڵك دەخەیتە سەرووی ئاستی خۆت (پێویستییەکانی ئەو لەسەرەوەی پێویستیەکانی خۆت دادەنێیت).

ئێستا حەزت لە کامە جۆرە...؟

داوا لە خوای گەورە دەکەین کە لە کەسانی ئاستی سێ یەم بین.

## ئامانجی خۆنەویستن

ئامانجی خۆنەویستن پەسەند کردنی ڕەزامەندی خوایە بەسەر ڕەزامەندی خەڵك، وە پەسەند کردنی ڕەزامەندی خوایە بەسەر هەموو شتێکدا ، وە ڕەزامەندی خودا لەسەرووی هەموو حەز و ویست و ئارەزووەکانی خۆت.

هەمیشە ڕەزامەندی خودا لە پێش خۆت وخەڵك وە لە پێش هەموو شتێکەوەیە...لە خۆت بپرسە: بەچی خوا لێت ڕازی دەبێت؟

کە شتێکی خۆت یان خۆشییەکی دونیای خۆت نەویست دات بە کەسێکی تر ، ئەوا لە زەردەخەنەی ئەو کەسە کە دڵیت خۆش کردووە خۆشییەك لە دڵتا دەدۆزیتەوە...وە چۆن دڵی ئەوت خۆش کردووە ئاوا دڵی تۆش خۆش دەبێت...

ئایا پێشتر ئەومت چێژتووە ؟

ئامانجی خۆنەویستن لە دڵتا پیارێزە: (پەسەند کردنی ڕەزامەندی خوا بەسەر خۆت وخەڵك و بەسەر هەموو شتێکی تر) وە دەست بکە بە جێ بە جێ کردن.

## وونەی کۆتایی (لە دڵەوە بۆ دڵ)

پیاو چاکێك پێش مردنی وەسیەتنامەیەك بۆ کچەکەی دەنووسێ کە تیایدا دەڵێ: " کچەکەم چی تر لە مردن ناترسم ئەگەر هەر ساتێك بۆم هات، ئەوا من لە دونیادا زۆرم وەرگرتووە.

مەبەستم زۆرم بەخشیووە، کچی خۆم هەندێ جار جیا کردنەوە لە نێوان وەرگرتن و بەخشین زۆر سەختە، چونکە ئەو دووانە لای خواناس و بڕوادار یەك مانا دەبەخشێت و یەك واتا دەدات، وە هەرجارێك چیم بەخشیوە وەرم گرتۆتەوە، بەڵکو زیاترم وەرگرتووە لەوەی بەخشیتم".

بەخوا ئەوانە چەند ووشەیەکی گەورە و کاریگەرن گەر گەیشتە زووانی دڵە پاکەکان.

ڕاستە...هەر قسەیەك لە دڵەوە دەرچێت دەچێتە دڵ و ناچێتە شوێنێکی تر.

چاوەڕێی چی...؟! نەگەیشتی...؟!

ئاخ بۆ تۆ... شەمەندەفەرەکە گەیشتە وێستگەی سەرەکی...!!!

دەی هەڵسە بجووڵێ... بڕۆ لە جێگا ئاسوودە و پڕ لە ئارام و خۆشیەکانا بگەڕێ...چاوەڕێی چی دەکەیت...؟!

## ناوەرۆك



كتێبخانەی نارین
چاپ دابەش كردن بڵاوكردنەوە
هەولێر – گۆڕەپانی شێخ مەحموود – نزیك پارێزگا
باڵەخانەی( سیّد بهاءالدین)
پۆستی ئەلیكترۆنی nareen_1@yahoo.com